45
پرۆژەی تیشک

د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

# گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان



چیرۆکێکی پەروەردەییە لە بارەی ئایین و بیروباوەڕ و
پەروەردەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری بۆ گەنج و بەساڵاچووان

وەرگێڕانی: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز

پڕۆژەی تیشک

# گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان

چیرۆکێکی پەروەردەییە لە بارەی ئایینو بیروباوەڕو پەروەردەی کۆمەڵایەتییو رامیاریی بۆ گەنجو بەساڵاچووان


نووسینی:

د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی:

بوشرا صدیق عەبدولعەزیز



٢٠٠٩ زایینی

١٤٣٠ کۆچی

ناوی کتێب: گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان

نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان

وەرگێڕانی: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز

ژمارەی سپاردن: (٢٤٥٣) ساڵی (٢٠٠٨)

شوێنی چاپ: خانەی چاپو بڵاوکردنەوەی چوارچرا

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

نەخشەسازی بەرگ: فازل قەرەداغی

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٤٥)



ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

# پێشەكی وەرگێڕ

بەناوی خوای مەزن و دلۆڤان

هەردوو كتێبی (**جزيرة البنائين**)و (**كنوز جزيرة البنائين**) كە نووسەری دیاری سعودی نووسیونی، یەك ئەوی تریان تەواو ئەكاتو ئەو بیرو ڕایانەی كە لە كتێبی یەكەمدا هاتووە لە كتێبی دووەمدا راڤەو نمونەهێنانەوەی زیاتری بۆ كراوە.

دكتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان كە یەكێكە لە پیاوە رۆشنبیرو بیرمەندەكانی جیهانی ئیسلامیی‌و پیاوێكی بە تەمەن‌و خاوەن ئەزموونیشە لە ژیانیداو ساڵزدی (١٩٣٦)ی عیسایییە، لەم دوو كتێبەی ئەودا سێ راستی زۆر گرنگ‌و لەبیركراو هەیە پێویستە خوێنەران بە گشتی‌و بەرەی لاوانی دڵپڕ لە ئومێدی ئیسلامیی بە تایبەتی بیزانن، ئەو سێ راستییەش ئەمانەن:

یەكەم: پیشاندانی قورئان وەك سەرچاوەی یەكەمی ئیسلام كە كتێبێكەو بنەماكانی بیرو بیركردنەوەو كارو كردەوەو دەستوورو یاسای هەموو لە خۆی گرتووەو ئەوەشی وای كردووە كە هەندێ كەس قورئان بەو شێوەیە نەبینێ ئەوەیە كە بە (زەمان)و (مەكان) ئەم قورئانە كۆت‌و زنجیر ئەكاتو بەو شێوەیەش ناتوانێ ئاسۆكراوەكان ببینێ‌و مانا وردو جوانەكان لە قورئان وەرگرێت كە مەگەر هەر خوا بزانێ چەندە زانیاری وردو گرنگ‌و سەیری كەبس كردووە لە ناو وشەو رستەو چەمكەكانی ئەم كتێبەی خۆیدا كە بڕیاری داوە تا دونیا دونیایە ئەم مرۆڤە تێر بكات لە رووی رۆحی‌و فیكری‌و دەروونی‌و یاساییەوە.

دووەم: پیشاندانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ كە تەفسیرێكی عەمەلی ئەم قورئانەیەبەوەی كە پێغەمبەر ﷺ پێشەوایەكی گەورەیەو فەرموودەكانیشی پڕ بەرەكەت‌و پڕ فەلسەفەیەو كەسێك لەمە حاڵی ئەبێت كە بە كۆت‌و زنجیری بڕیارە پێشوەختەكان روانینی خۆی بەند نەكات، بەڵكو وا سەیری بكات پێغەمبەرێك ﷺ كە نەخوێندەوار بوو بێت‌و لە كۆمەڵگەیەكی كەناروێی كاریگەردا ژیابێت‌و كەچی ئەو هەمووە گەوهەرە لە ژیانیدا دەركەوتبێت بێگومان هیچی تری نییە ئەوە نەبێت پێغەمبەری خوایەو گەورەترین مرۆڤیشەو ئەوانەشی شوێنی ناكەون لێیان قەوماوەو بەرەو دۆڕانو نەگبەتی ملی رێگەیان گرتووە.

سێیەم: پیشاندانی ئەوەی کە ئەم قورئانەو ئەم پێغەمبەرە ﷺ یەك ئەوی تریان تەفسیر ئەکات، ئەم مایەی مانەوەی ئەویانەو ئەویان مایەی مانەوەی ئەمیانە، هەر بۆیە گروپە لادەرەکان هەمیشە هەوڵیان لەوەدا چڕدەکەنەوە کە سیفەتی پێغەمبەرایەتی لە (موحەممەد ﷺ) بکەنەوە تا قورئان تاك بکەنەوەو چۆنیان ویست وا تەفسیری بکەن، بەڵام چەند گرنگە کاتێك کە بەڵگەی دەستی ئەو گروپە لاوازانە پوچەڵ ئەکرێتەوە بەوەی پێی ئەڵێی ئەو چەمکەی تۆ لەو ئایەتە دەرتهێناوە، پێچەوانەی ئەو چەمکەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەریگرتووە.

بۆ نموونە: قادیانیەکان ئەڵێن: میرزا غولام ئەحمەدی ڕێبەری ئێمە خواکردوویەتی بە پێغەمبەر، لە وەڵامدا پێیان ئەوترێ ئەی مەگەر خوا نافەرمووێ: (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ)(الأحزاب : ٤٠ )، ئەوان ئەڵێن:/ "خاتەم" یانی "أفضل" پێیان ئەوترێ: ئاخر پێغەمبەر ﷺ تەفسیری ئەو ئایەتەی وا نەکردووە، بەڵکو فەرموویەتی (لا نبـي بعدي) یان، ئەفەرمووێ: (لو كان بعدي نبـي لكان عمر)...

بۆیە کە قورئانەو پێغەمبەر ﷺ ئاوێزانی یەکتری ئەبن، بینیشێکی کامڵەو بێ لەکە دروست ئەبێت بۆ موسڵمان، بەڵام بە پێچەوانەوە قورئان دوور لە حەدیس، یان حەدیس دوور لە قورئان بینشێکی کورتەو ناکامڵ دروست ئەکات،ئەوانە ئەبنە (القرآنين)و ئەمانیش ئەبنە (أخباريين) بەڵام کۆکردنەوەی هەردوکیان ئەبێتە (ربابيين).

خوای گەورەش ئەفەرمووێ: (وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ) (آل عمران : ٧٩ )، دکتۆر سلێمانیش (خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە) سەر لەنوێ چەمکە ئیسلامییەکان دائەڕێژێتەوە لەسەرەتاوە تا کۆتایی، بۆ نموونە چەمکی (ئوممەتی ئیسلامی، یان چەمکی شارستانێتی ئیسلامی، یان چەمکی یاساو شەریعەتی ئیسلامیی.... هتد).

دکتۆر سلێمان خانەکانی دەسەڵات ئەکاتە سێ خانە (خانەی ئاشتیو ئیسلام)و (خانەی وادەو پەیمان)و (خانەی شەڕو ئاژاوە) ئەوەتا ئەڵێ: (إن العالم في منظور الدولة على ثلاثة أحوال هي: دار السلم ودار العهد و دار الحرب)[١]. دکتۆر باسی تێگەیشتن لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەکاتو ئەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ بە چەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووە لە ژیانی موبارەکی خۆیدا، سەرەتا بە قۆناغی پێغەمبەرایەتیو گەیاندنی سروشی خودا دەستی

[1] كنوز جزيرة النبائين ل ١٣٥.

پێکرد، پاشان چووەتە قۆناغی بانگەوازیی‌و مامۆستایەتیی‌و پاشان چووەتە قۆناغی دەوڵەتداریی‌و سەرۆکی دەوڵەت‌و دەستی داوەتە بیناکردن‌و دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی کەم وێنە بە دیدی ئیسلام)، بۆیە پێویستە ئەو قۆناغانە هەر یەکەیان بە جیا سەیر بکرێن‌و هەڵوێست لە هەریەکەیان یەکسان نییە بە ئەوی تریان...

بە هەر حاڵ لەم کتێبەدا چەندین چەمکی تازە ئەبینی دەربارەی ئیسلام‌و بیری ئیسلامیی‌و بیرمەندانی ئیسلام، بەڵام ئەوە دوبارە ئەکەینەوە ئەم کتێبە تەواوکەری کتێبی ژمارە (٢٦)ی پرۆژەی تیشکە بە ناوی (دوورگەی بیناسازان) لەگەڵ ئەودا پێکەوە وێنەکە تەواو دەکەن‌و بە چاکی‌و بە روونی (دیدی ئیسلام) بۆ مرۆڤو ژیان‌و بوونەوەر ئەبینی.

ئومێدەوارم کە منیش بەم کارەم توانیبێتم ئیشێکی باشمکردبێت‌و لە گۆشەیەکەوە هەندێ چەمکم راست کردبێتەوە کە پێویستە راست بکرێنەوە.

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي ولكم

**بوشرا صدیق عەبدولعەزیز**
**٢٠٠٨/٥/٢٥**

# پێشەکی نووسەر

خوێنەرانی بەڕێز:

ئەم چیرۆکەی لەبەردەستدایە چیرۆکێکە وتووێژو ڕووداوەکانی لەسەر زمانی ئەدیبو فەیلەسوفی دانا (بەیدەبا) خاوەنی کتێبی چیرۆکە بە ناوبانگەیانی (کلیلەو دمنە)یە، کە ئەم چیرۆکە درێژیەپێدەری چیرۆکی پێشوویە بە ناوی (دوورگەی بیناسازان ـ جزیرة البنائین).

مەبەست لەم چیرۆکەش خستنەڕووی بیروڕاو گۆڕینەوەیەکی فیکرییە کە ڕێبازو چەمكو تێڕوانینێکی گەردوونی ئیسلامییو شارستانی بۆ مرۆڤی هاوچەرخ گرتۆتە خۆی، داڕشتنی بنەماکانی ئەم ئوممەتەو تێڕوانینە گشییەکانیو داڕشتنەوەی لەسەر ڕۆشنایی ژیانو ئەزموونی سەردەمی پێغەمبەرایەتی لەگەڵ پەندو ئەزموونەکانی نەتەوەی ئیسلامیی بە درێژایی مێژووە دەوڵەمەندەکەی.

خوێنەری خۆشەویست:

ڕوونو ئاشکرایە بەبێ پێداچوونەوەیەکی دروست بۆ بینشو تێڕوانینی ئەم ئوممەتەو بەرنامە فیکرییەکەیو ڕێگاو شێوازی پەروەردەیی نەوەکانی، ئەم نەتەوەیە ناتوانێت لەم سەردەمەدا چاکیو ڕۆڵە پێشەنگیەکەی خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ بیناکردنەوەی مرۆڤایەتیو ڕێڕەوە شارستانییەکەی.

لەبەر ئەوە باوەڕمان وایە ئەم چیرۆکەو قسەو ڕاگۆڕینەوەکانی کە تیایدا ئەبینین کارێکی پێویستە بۆ هەر گەنجێکی موسڵمان، چ کوڕو چ کچ، هەروەها بۆ دایكو باوکێکی موسڵمان بۆ هەر ڕۆشنبیرێکی موسڵمان چ پیاو چ ئافرەت، لەبەر ئەوەی قورسە لەسەر مرۆڤی هاوچەرخ ـ جگە لە شارەزایانو پسپۆڕان ـ بە هۆی فراوانبوونی زانیاریو زۆری سەرقاڵیو بەرپرسیارێتی گەنجو ڕۆشنبیران بە گشتی پەی بەرن بە هەموو ئەو مەسەلانەی کە لەم چیرۆکەدا هاتووەو ئەو بیرۆکە ئاڵۆزەی کە سەرچاوەکەی ئایینو کۆمەڵایەتییو فەلسەفییو زانستییە، لەبەر ئەوە مەبەست لە دانانی ئەم چیرۆکە ئەوەیە هەمووی لە پەرتووکێکدا بە ڕێگای چەند چیرۆکێکی ئاسانو سادە پێشکەشی خوێنەر بکرێت، هیوامان وایە گەنجەکانمان لەگەڵ دایکانو باوکانو ڕۆشنبیران بە بایەخەوە سووربن لەسەر خوێندنەوەیو گفتوگۆ بکەن لەسەر بیرو ڕووداوەکانی بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی بیروڕاکان لە پێناوی پاشەڕۆژێکی گەورەتر بە ئیزنی خوا. لەگەڵ باشترین هیواو پاڕانەوەی سەرکەوتنو هیدایەت

# میوانی دوورگە (إبن بطوطة)

ئەم چیرۆکە نادیارە یەکێکە لە چیرۆکەکانی بەیدەبا دەربارەی هەواڵەکانی دورگەی بیناسازان کە لە داناو گەڕۆکی موسڵمانی بەناوبانگ ئیبن بەتوتە بیستوویەتیو ئەو گفتوگۆو باسانەی کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە کە ڕووئەکاتە لاوەکانو دایکانو باوکان هەروەها مەبەستی ڕۆشنبیرانو چاکسازانە بە ڕێگای چیرۆك بۆ ئەوەی بە سووكو ئاسان مامەڵە بکرێت لەگەڵ ئەو گفتوگۆو ڕووداوانەی کە تیایدا هاتووە، هەروەها پەی بردن بە داناییە بەرنرخەکانو ئامۆژگاریو تێڕامان لەو بوارانەی کە گەلانی ئەم نەتەوەیە ئەگرێتەوە بۆ بەرەو ڕاپەڕینو چاکسازییو بەرزێتی بە ئیزنی خوا.

بەیدەبای دانا ئەڵێ: مامۆستای گەڕۆك **(إبن بطوطة)** زۆر بە سەرسوڕمانەوە باسو هەواڵی دوورگەی بیناسازانی بۆ ئەگێڕامەوە- کە چەندین شەپۆلی دەریاو دەشتو چۆڵەوانی بڕیوە هەتا پێی گەیشتووە بۆ ئەوەی خۆی زانیاری دەربارەیان بزانێتو ئەو هۆیانە بدۆزێتەوە کە ئەم دوورگەیەی زیاتر خۆشیو پێشکەوتنو ئاسایشو ئاشتی پێ بەخشیوە.

ئیبن بەتوتە دوای گەشتەکەی بۆ دوورگە چۆن حەزی بە گێڕانەوەی کردووەو ئەو شتانەی تیایدا دیویەتی لە چاکی پەروەردەی ڕۆڵەکانی ئەو وڵاتەو جوانی هەڵسوکەوتو نەرمو نیانیو ڕاستگۆییو دڵسۆزییان لە هەڵوێستو ئیشو کاریاندا، هەروەها بەهرەمەندییان بە برایەتییو خۆشەویستییو میهرەبانییان، گەر هۆکەی بزانین ئەوا بە شێوەیەکی سەرەکی ئەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانیان بە کاری خێزانداریو دایکایەتییو ڕوناکبیریی دایكو باوکانیانو چاودێریکردنی ڕۆڵەکانیانو چاندنی خووڕەوشتو بنەمای بەرز تیایاندا هەر لە منداڵییەوە، لە گرنگترین ئەو سیفەتانەی کە بناغەی خووڕەوشی تاکە کەسێکە: بایەخدانە بە خێزانو پاراستنی ڕێزی مرۆڤە کە لە پێشینانەوە ڕێزی دایکایەتییو مێینەتیو وەبەرهێنانە. مێینەتی لای ئەوان بریتی نییە لە شمەکێکی هەرزان بۆ بازرگانی پێکردنی، بەڵکو شکۆی دایکایەتییەو سەرچاوەی ڕێزەو لانکەی کۆمەڵگایە.

بەیدەبا دەڵێت: جوانترین ئەوشتانەی کە لە شێخ ئیبن بەتوتەوە لە بارەی پەروەردەوە بیستم، ئەوەی لە بارەی دایکانی دۆڵی دوورگەوە ئەیگێڕایەوە کە چۆن خۆشەویستییو حەزو ئارەزوو لای منداڵ دروست ئەکەن کە هۆیەکی سەرەکییە بۆ گەشەپێدانی ڕۆڵەکانیانو پەروەردە ڕوناکبیرییەکەیان، شێخ ئیبن بەتوتە بۆ ئەو ڕەوشتەیان نموونەیەکمان بۆ

دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەم دوورگەیەدا هەنار ئەڕوێتو بە هۆی خاكو ئاو و هەوای پاکی ئەو شوێنەوە دار هەنارەکان خۆشترینو بەتامترین بەروبوومیان ئەبێت، ئەو دەنکە هەنارەی بەری جلو بەرگ، یان شتومەکی ماڵەکانیان بکەوتایە زیاتر ڕەنگەکەی پێوە ئەنووساو بلاو ئەبوویەوە بە تایبەتی ئەگەر منداڵەکانیان بیانخواردایە، بەڵام دایکەکانیان بە حوکمی پەروەردە ڕووناکبیرییە بەرزەکەیان ئەیانزانی ئەگەر فەرمان بکەن بە منداڵەکانیان ئەو دەنکە هەنارانە نەپرژێنن بە ماڵەکەیانداو جلەکانیان پیس نەکەن سوودی نییە، چونکە منداڵ ناتوانێ فەرمان جێبەجێ بکاتو زۆر ئەجووڵێتو زوو شت لە بیر ئەکات، لەبەر ئەوە دایکەکان فێڵێکیان بەکار ئەهێنا کە منداڵەکانیان حەزیان ئەکرد بە گوێیان بکەن بێ ئەوەی هەست بە ئەمرو زۆرەملێ بکەن، لەبەر ئەوە ئەیانو بە منداڵەکانیان لە هەر هەنارێکدا دەنکێکی تێدایە لە بەهەشتەوە هاتووە هەر کامێتان هەموو هەنارەکە بخواتو هیچ نەپرژێنێت ئەوە لە دەنکە هەناری بەهەشتی خواردووە، بەم شێوەیە دایکەکان حەزو ئارەزوویان لە منداڵەکانیان دروست ئەکرد بۆ خواردنی هەنار بە بێ پژاندنی.

ئەم فێڵە جوانە مانای خۆشەویستییو ئارەزووی دروست ئەکرد بە هەموو سوودەکانیەوە بۆ هاندانی منداڵو بەرەو پێش چوونی ئەو شتانەی داوای لێ ئەکرێت کە ئەوەش یەکێکە لە شێوازەکانی پەروەردەی داهێنەرانەی سەرکەوتوو، پێویستە دایکانو باوکات تێی بگەن لە پەروەردەی کچو کوڕیان بە شێوەیەکی کاریگەرو سەرکەوتووانە.

بەیدەبا دەڵێت: هەروەها پرسیم لە مامۆستا (ئیبن بەتوتە) دەربارەی نموونەیەکی خراپی پەروەردە کە دیویەتی، ئەویش دروستکردنی هەستی ترسو لەرزو تۆقاندن لە دەروونی منداڵدا شێخ (ئیبن بەتوتە) وتی: پەروەردەی خراپ ئەو پەروەردەیەیە کە لەسەر ڕقو کینەو تۆقاندنەو هەستی ترسو بیمو ڕق لە دەروونی منداڵدا دەچێنێت، کە ئەمەش بە دروستبوونی دژیاریو لەچبازی کۆتایی پێ دێت، یان ئەبێتە هۆی درستبوونی ترسنۆکیو هەست بە داماویو ملکەچی، هەروەها دروستکردنی دوو ڕوویيو درۆزنیی، هەریەك بە پێی سروشتی پەیوەندیی نێوان منداڵو بەخێوکەرو سروشتی ئەو ڕێگا خراپانەی کە بەخێوکەر پەنای بۆ دەبات لە پەروەردەی منداڵو چۆنێتی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا.

بە پێچەوانەی نموونەی پێشوو کە بۆی گێڕامەوە لە بارەی دایکە لێهاتووەکانی دوورگەی بیناسازان، نموونەیەکی بۆ باسکردم دەربارەی پەروەردەی نەشیاو، ئەویش بە چاندنی هەستی ترسو لەرز لەدەروونی منداڵدا.

شێخ وتی: تۆ دەزانیت ئەی بەیدەبا ئەمنو ئاسایش لە چاخە کۆنەکانەوە هەتا ئەمرۆش، لە زۆربەی وڵاتاندا ونبووە، دایکانیش کاتێك ئەترسان لە چوونە دەرەوەی منداڵەکانیان بەتایبەتی دوای رۆژئاوابوون لە ترسی درِندەو دەروون چەپەڵەکانو بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو بارودۆخە دایکانی نەزان پەنایان ئەبردە بەر فێڵێك کە ترسو دڵەراوکێی ئەخستە دڵی منداڵەکانیان بۆ ئەوەی کاتی تاریکیو شەوگار نەچنە دەرەوە، ئەویش بە دروستکردنی چیرۆکی (**السعلیة**)[1]، لای هەندێکیان ناوی چیرۆکی (**الدجیرة**) بوو، چەند ناوێکی تریش هەبوو کە باسی لە جنۆکەیەکی درِندە دەکاتو لە جلوبەرگی ژناندا ئەچێتە دەوروبەری کۆڵانە باریکەکانو نێوان خاڵەکان ئەگەڕێتو لە دوای ئاوابوونی رۆژو هاتنی تاریکی بە دیار منداڵەوە ئەوەستێ بۆ ئەوەی لێیان بداتو بیانکوژێت.

لەم ئەفسانەدا ئەم (سعلیە) بە شێوە لە ژن ئەچێت، بەڵام لە جیاتی قاچ سمی هەیە، کە لە سمی گوێدرێژ دەچێتو پێویستە وردیلەکان نەچنە دەرەوە تا (سعلیە) نەیانفرِێنێتو زیانیان پی نەگەیەنێت، شێخ (ئیبن بەتوتە) ئەڵێت: کەواتە ئەبێت چاوەڕوان بین ئەم جۆرە پەروەردەیە ببێتە هۆی چاندنی ترسو لەرز بە تایبەتی لە کاتی تاریکیو شەوداو بۆ شوێنێکیش کە ئولفەتیان پێوە نەگرتبێ، ئەمەش لە خۆیدا ئەبێتە هۆی کوشتنی گیانی ئازایەتیو بوێری لە منداڵی ئەم جۆرە دایکانەدا.

بەیدەبا دەڵێت: سووربووم لەسەر گێڕانەوەی وتەکانی شێخ (ئیبن بەتوتە) لەسەر نموونەی پەروەردە لە کاتێکدا پەندو ئامۆژگاریی تێدابوو بۆ دایکانو باوکان، هەتا رێزی بەهای پەروەردە بزاننو بە کەمی نەزانن، چونکە ئاسەواری خراپیان تیا بەجێدەهێڵێو هەستیشی پێ ناکەن هەتا دوای پێگیشتنو گەشەی دەروونیو دوای بەسەرچوونی کات.

بەیدەبا لەسەر یادەوەرییەکانی خۆی بەردەوام دەبێت، سەبارەت بەو شتانەی مامۆستای گەڕۆك (ئیبن بەتوتە) بۆی باسکردبوو لە بارەی دوورگەی بیناسازانەوە، گرنگترین ئەو سیفەتانەی تێبینی کردبوو لە رۆڵەکانی ئەم وڵاتە، بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنیان بوو، ئەوان بەهرەمەند بوون بە کارامەییو هەستی خۆشەویستییو رێزو بەرزیی کە دوور بوو لە درۆو خۆ بەزلزانی، هەروەها بەهرەمەند بوون بە زۆری کشتوکاڵو پیشەسازییەکانیان هەتا

[1] ئەم جۆرە چیرۆکانەش لە ناو کوردەواریدا هەر باو بووە، وەك (شەولەبان)و (ئایشێ گوێ درێژ)و وێنەی تری وەك ئەوانە.

بیّ کارەکیەکت لە نێوانیاندا دەست نەدەکەوت، ئەمەش ئەگەڕایەوە بۆ جوانی پەروەردەو فێربوونیانو پێشکەوتنی خوێندنگاو پەیمانگاکانی راهێنان لای ئەوان.

بایەخی ئەوان بە منداڵو دایکایەتییو بەخێوکەر جوانترین شتێك بوو کە ئیبن بەتوتەی گەڕۆك بیستبووی‌و دیتبووی لێیانەوە، بە شێوەیەك هیچ جێگایەك نەبوو بایەخی دایکایەتییو مێینەتیی تێدابێت ئیللا لای ئەوان باشتر بوو، هیچ جیگایەکی پەروەردەییو رۆشنبیرییو حەوانەوە نەبوو گەشەبدات بە وزەی منداڵو تواناکانی جگە لە لای ئەوان بە باشترین شێوە بوو.

ئەوا بایەخیان ئەدا بە منداڵو لاوەکانیانو بە درێژایی ساڵو بە هەموو جۆرەکانی کارو چالاکییەکان لە خوێندنگاو پەرتوکخانەو یانەو چادرگەو شارو لادێو لە ناو دۆڵو لوتکەی شاخو شەپۆلەکانی دەریاو کەناری رووبارەکان.

بەیدەبا وتی: کاتێك مامۆستای گەڕۆك باسی خێزانو پلەوپایەی ئافرەتی دەکرد لە ناو دوورگەدا: پرسیم لێی ئەی هەڵسوکەوتی ئافرەت لەگەڵ پیاو و هاوسەرەکانیان چۆنە؟

مامۆستا وەڵامێکی سەیری دامەوە کە پڕی بوو لە گاڵتەجاڕیو رابواردنو وتی: هەڵسوکەوتی ژنان لە دوورگەی بیناسازاندا لەگەڵ مێردەکانیان وەکو گوێدرێژو خاوەنەکەیەتی، بەیدەبا لە کاتێکدا ئەم وەڵامە پێکەنیناوییەی بیست، بە شێخی گەڕۆکی وت: وا ئەزانم گاڵتە ئەکەیت، تۆ وەسفی خەڵکی دوورگە دەکەیت چۆن وا دەڵێیت؟!

(ئیبن بەتوتە) وتی: تۆ راست دەکەیت، بەلام پەلە مەکە هەتا تێئەگەیت چی ئەڵێم، ئەوەی کە بۆم باسکردیت، حیکمەتو سەلیقەیەکی گەورەی تێدایە، خۆزگە ئافرەتی ئەم زەمانە هەموو تێئەگەشتنو بەهاکەیان ئەزانیّ، بەتایبەتی لەم رۆژگارەدا ئەوەی ئەیبینین لە حاڵی هاوسەرانو گەنجانو ئەوەی لە نێوانیاندا هەڵئەگیرسێت لە کیبّشەی خێزانییو هەراو هوریا لەبەر چەند هۆیەکی سەیرە کە زۆربەیان بە جیابوونەوەو سەرلێشێواوی منداڵ کۆتایی پیّ دێت.

بەیدەبا وتی: وتم بە شێخ توخوا بۆم روون بکەرەوە مەبەست چییە بە ویستی خوا ئارام ئەگرمو گویّ ئەدەمیّ.

مامۆستا (ئیبن بەتوتە) وتی: لەوانەیە لە بیرت بێت چۆن لە سەردەمە رابردووەکاندا، بەڵکو لە زۆربەی لادێی ولاتە هەژارەکاندا هەتا ئەمرۆش چۆن هاتووچۆو گوێزانەوەی شتومەك لەسەر پشتی وشترو ماین ئەکرا، لەبەر ئەوەی گوێدرێژ لە نێو ئەوانەدا خۆڕاگرو

ئۆقرەی زیاتر بووە، هەروەها خواردنو عەلفی کەمی تێچووە، زۆرترین ئاژەڵ بووە کە بەکارهاتووە بۆ بارو گوێزانەوە.

خاوەنی گوێدرێژەکان رایان ئەگرتنو بایەخیان پێئەدا، چونکە پێداویسییەکانیان بەجێ ئەهێناو لە هاتووچۆی ئەم کەرانەدا، بژێوی خۆیان پەیدا ئەکرد.

لەبەر ئەوە خاوەن کەرەکە رۆژانە بەردەوام بوو لەسەر بایەخدان بە خواردنو خواردنەوەیو شوێنی خەوو پاکو تەمیزی گوێدرێژەکەی هەتا ئەو رۆژانەی ئیشی قورسی پێئەکرد تەندروستی ئەپاراستو ئاگای لێی ئەبوو، چونکە بەکاری ئەهێناو بژێوی لەسەری بوو، ئەوەندەی بایەخی بە گوێدرێژەکەی ئەدا گرنگی بە خۆی نەئەدا، چونکە ئەگەر بە پێچەوانەوە پشتگوێی بخستایە ئەوە نەخۆش ئەکەوتو ئەفەوتا سەرمایەو سەرچاوەی رزقیشی لەگەڵیا یائەچوو.

بەساڵانچووانی ئەو دوورگەیە ئەی بەیدەبا ئامۆژگاریی کچەکانیان ئەکرد لە کاتی شووکردنداو لە سەرەتای ژیانو گەنجێتییاندا، لە هەمان کاتدا قۆناغی منداڵبوونو وەچە خستنەوەو پەروەردەی وردیلەکانیان بوو، وایان لێئەکردن لەم قۆناغەدا بایەخی تەواو بدەن بە ماڵو مێردیان، ئافرەت گرنگی ئەدا بە هاوسەرەکەی لە کاتی گەڕانەوەیدا ئێواران بۆ ماڵەوە نموونەی گوێدرێژو خاوەنەکەی بوو هەتا وای لێ ئەهات بۆ بەیانی بە تواناو لێهاتوو ئەبوو لە ئیشەکەیدا بۆ فەراهەمکردنی پێداویستی خۆییو دەرووبەرەکەی، ژنانی ئەم دوورگەیە بەم شێوەیە لەسەر ئەو سیاسەتە ژیرانە بوونو بەو داناییو سەلیقە زێڕینەیان کە بە خەرجیان ئەدا لەگەڵ هاوسەرەکانیان خۆشبەختییان بۆ خۆیان ئەهێنا، چونکە پێداگربوون لەسەر چاودێریی ماڵو مێردو خێزانیان بە دڵسۆزییو سۆزو خۆشەویستیی، هەروەها بەبێ ماندووبوون سووربوون لەسەر پشوودانی هاوسەرەکانیان لە کاتی گەڕانەوەیاندا بە شەودا بە رووی خۆشییو دەم بە پێکەنینەوە بە دەمیانەوە بوونو ئولفەتیان پێوە ئەگرتنو ئولفەتیان پێوە ئەگیراو پێویسییەکانیان بۆ بەجێ ئەهێنان، لەبەر ئەوە مێردەکانیشیان هەموو هەوڵو کۆششێکیان لە پێناوی رەزامەندیی ژنەکانیانو پێداویستیی خۆیانو منداڵیان بوو، ئافرەتە خانەدانەکانیش بە یەك رستەی کورتو پڕ لە پەند تەعبیریان لێ ئەدایەوە کە پێویستە بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێتەوە لە بارەی تێگەیشتنی ژن لە پیاوەکەیو باشی هەڵسوکەوتی لەگەڵیدا، ئەویش ئەوەیە ئەبێت: "بە شەو پاسەوان بێتو بە رۆژیشدا بارهەڵگر".

بەمشێوەیە هاوسەرانت لە دوورگەی بیناسازاندا بە کامەرانیی ئەبینی، خۆشەویستیی و گرنگیی و بایەخدان لەلالایەن ژنانی و هەوڵ و تێکۆشانیش لە لایەن پیاوانەوە.

ئەی بەیدەبا ئێمە زوڵم لە گوێدرێژ ئەکەین، چونکە لە راستیدا سیفەتی جوانیان تێدایە، باشترین هاوسەریش بۆ خێزانی ئەوەیە سیفەتی ئەو گوێ درێژەی تێدابێت، خۆزگە ئافرەتانی ئەم سەردەمە لەمە تێئەگەیشتن و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ هاوسەرەکانیان وەك کەرو خاوەن کەرەکە وابووایە، ئەمەش ئەی بەیدەبا شتێکی بە دی هاتووە، چونکە سیفەتی زۆربەی پیاو وەك سیفەتی ئەو گوێدرێژەیە کە بە هێزە ئارامگرە زیرەکە سروشتیی هێمنە زۆر بە تەحەموله لە سروشتیدا لاساری و توندوتیژیی نییە، خاوەنەکانیان باریان لێ ئەبەستن و رێگای خۆیان ئەزانن و ڕاهاتوون لەسەری بەبێ بەرێکەرو رێگا نیشاندەر.

ئەی بەیدەبا گوێدرێژ تووڕە نابێت، مەگەر خاوەنەکەی لە ئازاردانیدا زیادە رەوی بکات ئەو کاتە تووڕە ئەبێت لاساریی و ئینکاریی خۆی ئەنوێنێت و جووتە ئەوەشێنێ و تۆڵەی خۆی ئەکاتەوە و دوورئەکەوێتەوە لە خاوەنەکەی.

هەموو پیاوان وەك یەکن و هەمان سیفەتیان تێدایە توانای ئەوەیان هەیە چاودێریی و سەرپەرشیی لە ژنەکانیان بکەن و کار بکەن بۆ فەراهەمکردنی پێویستیەکانیان ئەمانە هەموو بەدیدێن ئەگەر ئافرەتان بزانن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ پیاوەکانیاندا، لەبەر ئەوەی بەیدەباگرنگە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەوڵ بدرێت بۆ پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی و سوور بین لەسەر تێگەیشتنی سروشت و پێویستی یەکترو کار بکرێت لەسەر گەشەپێدانی رۆشنبیریی خێزانیی و دایك و باوکایەتی و بکرێتە بڕبڕەی پشتی بەرنامەکانی پەروەردە و فێرکردن بۆ ئەوەی هاوسەران و دایك و باوك و رۆڵەکانیان بزانن چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتریدا بکەن لە ناو دەزگای خێزانێکدا، چۆن خزمەتکارو هاوکاریی یەك بن هەتا لە نێوانیاندا خۆشەویسیی و تەبایی و گیانی یارمەتیی سەقامگیر ئەبێت.

ئەی بەیدەبا پێویستە سوور بین لەسەر چاندنی ناوەڕۆك و سروشی دایکایەتی و باوکایەتیی لە پەروەردەکردتی مندالەکانماندا هەتا رۆڵی خۆیان بە باشی ببینن لە دروسکردنی خێزاندا کە بناغەی دروستکردتی کۆمەڵگایەو باوەشی بەرهەمهێنانی هاوولاتیانەو مایەی گەشەکردن و درسکردنی تواناکانیانە.

ناوەڕۆکی سروشتی دایکێتی و باوکێتی ئەوەیە خۆشەویستیی و قوربانیی لە لایەن دایك و پەیداکردنی رۆزی و هەست بە بەرپرسیارێتی لە لایەن باوك هەر کات ئەم جەوهەرە لە

سروشتی دایكو باوكدا له دەست چوو، یان رۆڵەكانیان تەنیا بوو بە رووكەش ئەوا خێزان ئەڕووخێو وەچەو باوان پێكەوە نەگبەتو پەرتەوازە ئەبنو پەیوەندی سۆزو خۆشەویستیو برایەتی لە كۆمەڵگەكاندا بەرەو نەمان دەچێتو بە تێپەڕبوونی كاتیش درزەكان گەورەتر دەبن لە ناو بناغەی كۆمەڵگادا هەتا بە رووخانو تیاچوون كۆتایی دێت.

بەیدەبا وتی: بەڵێ جەنابت راست ئەكەیت خۆزگایە كوڕانو كچانی ئەم هاودەمە سروشتی سەرەكی خۆیان ئەپاراستو تەواوكەری یەك بوونایەو رۆڵی خۆیان ببینیایەو هەر یەكە ئەو مافەی لە لایەن خۆیەوە بدایە بەبێ زۆرەملێو بێزاری. ئەگەر ئەمە بەدی بهاتایە بە هۆی پەروەردەی دروستی دایكو باوك كە پێویستە بڕبڕەی روناكبیریی دایكو باوكانی پاشەڕۆژ بێتو ئەگەر ئەمە بەجێ بهاتایەو پێداگیر بووینایە لەسەری ئەی بەیدەبا ئەو هەموو كێشەو هەرایەمان نەئەدی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی توندوتیژییو رووخانی خێزانو لێك ترازانیباوانو رۆڵەكان لە نێوان زۆربەی گەنجانی ئەم سەردەمەدا.

مامۆستا (ئیبن بەتوتە) وتی: ئەمانە هەموو شتێك نین ئەی بەیدەبا، لێرەدا چەند ئەركێك هەیە كە پێویستە كۆمەڵگا بەجێی بهێنێت بۆ ئافرەتانو دایكان ئەویش پەیوەندیی هەیە بە قۆناغی دوای سكو منداڵبوونو پەروەردەی خێزانی، واتە دوای ماوەی چل ساڵی، یان چلو پێنج هەتا شەستو حەفتاكانی تەمەن بە شێوەیەك كە ئافرەت لە ئەركی دایكایەتیی ئازاد دەبێو كاتێك لە سك دەچێتەوەو وردیلەكانی باڵەفڕدەبن ئەوكاتە باشترین تواناو ئەزموونو شارەزایی هەیە، چالاكییو بەشداریی كۆمەڵایەتیی لەم قۆناغەدا واتە دوای قۆناغی دایكایەتی بەنرخترین شتە كە ژیانی پێ پڕ بكاتەوەو هاوكاریی بكات لە خۆشگوزەرانیی كۆمەڵگاكەییو بەرەو پێشچوونی، لەبەر ئەوە ئەو كۆمەڵگایانەی كە بە راستی گرنگی ئەدەن بە پاراستنی ئافرەتو چاودێریی خێزانو دایكایەتییو پەیوەندیی سۆزو رێكوپێكی كۆمەڵایەتیی پێویستە بەرنامەو یاسایەك دابڕێژن كە پێداویستییەكانی دایكایەتی فەراهەم بهێنێت، هەروەها بۆ قۆناغی دوای دایكایەتیش بواری كاركردنیان بۆ بكاتەوە بۆ چوونە ناو بازاڕی كار، هەروەها ئەزموونی دایكایەتیو قوربانیەكانی بۆ ئەژمار بكرێت، لەگەڵ پسپۆڕیی لە بەڕێوەبردنی كارەكانی ناوماڵو خێزانو گرفتەكانی، تەمەنی چل ساڵی دائەنرێت ـ وەكو لە دۆڵو دوورگەی ئاشتیخوازان ـ بە ساڵی چوونە ناو ریزی جەماوەری ئافرەتانی بازاڕی كار كە یارمەتی كۆمەڵگا بە مرۆڤێكی پێگەیشتووی شیاوی بەرز ئەدات لە هەمان كاتیشدا كارێكە پێداویستییەكانی ئەو ئافرەتانەو دەركەوتنیان پڕ

ئەکاتەوە، جگە لەمەش ئەبێتە هۆی بەشداربوونیان لە سووککردنی گیروگرفتە خێزانییەکانو کەم کردنەوەی ئەو شتانەی کە ئەبێتەهۆی بەگژاچوونی ژیانی هاوسەرە گەنجەکان.

گرنگتر لە هەمووی ئەی بەیدەبا کاروباری ئافرەتو بەشداری لە چالاکی کومەڵگا. لەم قۆناغەدا ئاسودەییو زامنی زیاتری بۆ دابین دەکات کەلەم تەمەنەدا زیاتر پێویستی پێ یەتیو ڕێزی مرۆڤایەتی ئەپارێزێت لەبەردەم گرفتەکانی ژیانو ئەو بارودۆخەی کە هەڕەشە لە ئاسایشو هێمنیو خۆشگوزەرانی دەکات بەڵام سەیر ئەوەیە لەزۆربەی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ لەماوەی گەنجیو دایکێتیدا باری شانی ئافرەت قورسو گرانتر ئەکرێت وەکۆسپو تەگەرەیەکی زۆر لەبەردەم کارە بنەرەتیەکەیدا کەدایکایەتیە درووست دەکات بەڵام لەپاش ئەو ماوەیە ئافرەت

مایە پروچو بێ کار ئەکرێتەوە لەدوای ئەو ئیشەگرنگانەی کەتێپەڕی کردووە بێ کارو بەتاڵە ئەبێت کەهێشتا لە چڵە پۆپەی توانای لەشیو دەرونیدایە، بەڵکو لەوماوەیەدا زۆر بەتواناتریشەتا هاوتەمەنەکانی لەپیاوان ئەویش بەهۆی پێکهاتەی لەشیو گۆرانکاری هۆرمۆنی تیایدا بەشێوەیەك هۆرمۆنی ئافرەتان تیایدا کزدەبێتو هۆرمۆنی پیاوانەی تیا زیاددەکات ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزبوونی کەسایەتی بەپێچەوانەی پیاو لەم قۆناغەدا کەهۆرمۆنی پیاوانەی تیاکەم ئەبێتەوەو هۆرمۆنی ژنانەی تیا زیاددەکات کە خۆشبەختانە ئەم گۆرانکاریانە بەهێواشی ڕوودەدات ئەمەش ئەبێتە هۆی پێگەیشتنی پیاو پێش قۆناغی پیریو جەستەی لاوازو نزم بوونەوەی ئاستی کارکردن.

ئەی بەیدەبا پێویستە لەسەر نەتەوەوگەلە سەرکەوتووەکان کەپێویستە بەهۆی بناغەی بیرو بۆچونیان گرنگی بدەن بەخێزانو دایکایەتیو چاودێری مافەکانی ژنو بەتەواوی، هەروەها پەیوەندیو خووڕەوشتە کۆمەڵایەتیەکانو جێگیر کردنیان وە تێڕوانینێکی تێرو تەسەل پێشکەش بەخۆیو جیهانی ئەمڕۆ بکات کەلەسەر ڕێبازوبنەمایەکی رۆحی بێت بۆسرەشتی مرۆییو پاراستنی ڕێزو پلەوپایەی ئافرەتی تێدابێت کەدووربێت لەرابواردنو ئارەزووبازی ئاژەلانەی پێچەوانەی سرووشتی مرۆڤایەتیو بازرگانیکردن بەمێینەیەتیو کچێنی ئافرەت بەبێ ئەژمارکردنی دەرئەنجامەکەی وەك شمەکێكو یارییەکی فرێدراوی بەکارهاتوو کەدووکانو بازاڕونوسینگەکان پڕئەکاتەوە لەشولارو ڕێزو گەنجێتی خۆی ئەفرۆشێت بەرامبەر هەرکەسێك نرخی زیاتری بداتێ لەکاتێکدا قوربانی دەدات بەپاکێتیو ئابڕو و کچێنی خۆی دوورلەخۆشەویستی منداڵو چاودێری مێردو کانونی گەرمی خێزان.

بەیدەبا ووتی: ووتم بەشێخ هەموو قسەکانت راستە ئەی مامۆستای پایەدار خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئێستا تێگەیشتم چی دەڵێیتو مەبەستی گرنگت چیە. گرنگی ئەرکی گەلانو بیرمەندانی چاکخواز بەپێشکەشکردنی بیروبەرنامەیەکی بەدیل لەبری ئەو هەمووە قسە پڕوپوچو ساختانەی لەدەزگاکانی راگەیاندنەوەو هەڵخەڵەتاندن بەسامان بەرامبەر گەندەڵیو ستەمکردن لەئافرەت لەم سەردەمەداو ئەو خراپانەی دەیکەن, تکایە مامۆستاگیان قسەکانت تەواوبکە دەربارەی باسو هەواڵەکانی دۆڵو دوورگە.

شێخ ئیبن بەتوتە وەڵامی دایەوەو وتی: وازی لێبێنە بۆ بەیانی بەویستی خودا ئەمڕۆ بەسە.

بەیدەبا ئەڵێت: لەو ڕۆژەدا مەجلیسەکەمان جێهێشت زیاتر خۆمو برادەرەکانم تامەزرۆبوین بۆ گوێ بیستی وتەکانی مامۆستا(ئیبن بەتوتە) لەبارەی دۆڵو دوورگەوە دوای ئەوە کاتێك گەڕاینەوە بۆلای مامۆستاو تەوقەمان لەگەڵ کرد بەڕێزو ئەدەبەوە. شێخ پشیلە جوانەکەی لەبەردەمابوو هەروەکو سەگێکی پاسەوانی ڕاهێنراو دەهاتە پێش چاو کەپاسوانیو چاودێری مەجلیسەکەی دەکردو هەرکەس تورەی بکردایە بەر چنگوڵی تیژی ئەکەوتو بەچاوە خڕەکانی بەڕقەوە تەماشای ئەکرد.

بەیدەبا ئەڵێت: بێگومان پشیلەکەی(ئیبن بەتوتە) یەکێك بوو لەئاژەڵە سەیروسەمەرەکان لەجوانیو زیرەکی ئەوەندە وریابوو هەتا گومانمان دەبرد لە قسەکانی شێخ تێ دەگات. چەند جوان بوو وەختێ ئەهات پێشی ئەکەوت یان هەڵئەسا لە دانیشتنەکە ڕایئەکردولە پێشیەوە ئەڕۆیشت کاتێك قسەی ئەکرد لە بەردەمیا دائەنیشت.

یەکێکیتر لە سەمەرەی ئەو پشیلەیە لەهەر دانیشتنێکدا جارێكو دووان هاتووچۆی دەکردبەنێوان ڕیزەکاندا هەروەکە سەرنجی ئامادەبوان ڕاکێشێت بۆلای مەجلیسو ئێمەش جارجار دەستمان ئەهێنا بە فەروە سپی یە نەرمینەکەیدا ئەویش بەخۆشیەوە سەرنجی دەداینێ.

بەیدەبا ئەڵێت: ئەو پشیلە یەکێك بوو لەخۆشیەکانی مەجلیس. شێخ خۆشی ئەویست هەربەدەستی ئەو خواردنی ئەخواردو هەرشتێك لە خواردنو خواردنەوەمان بخواردایە بەشە شیرەکەی پشیلەکەی لەگەڵدابوو مامۆستا خۆی ئەیخستە بەردەمی.

# هەورەگرمە ڕەشەکان

بەیدەبا ووتی: لای مامۆستا دانیشتینو هێشتا لەباسەکەی دوێنێدا بووین لەبارەی بیرو بۆچونێکی بەدیل سەبارەت بەئافرەتو کاروباریو پاراستنی ڕیزو گەورەیی لە ڕێگای پەروەردەیەکی دروستەوەو یاساو ڕێسایەکی ڕاست.بەم شێوەیە گوێمان بۆ گرتبوو وە درێژەی بەقسەکانی داو هاتە سەر باسی دۆڵو دوورگە کە بینیمان یاساو نیزامی دوورگە زۆر جێگای سەر سوڕمانێتی. هەروەکو مامۆستا باسی ئەکرد یاسایەکی جوانو بە دڵا چووبوو ئەویش لەبەر تێرو تەسەلی دامو دەزگاکانیو پاککردنەوەی لە گەندەڵیو بەفیڕۆدانی ماڵی گشتیو بەرتیلو لێنە پرسینەوەی، فەرمان بەران کە ئەرکی سەرشانی خۆیان نەزنن، یان هەست نەکردنیان بە بەرپرسیارێتی  کە ئەمەش بێ گومان لە بنەڕەتدا ئەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی چاكو فێرکردنو ڕاهێنانیان وە بۆ ڕاگەیاندنی ڕۆشن کەرەوەی نوێ خوازی هەروەها ئەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی دەزگاکانی بانگەوازو چاندنی خووڕەوشتو ڕێگای بەرز لە دەروونەکاندا ئەمانەو بە تەنیشت دامەزراوەکانی یاسا دانانو چاودێری کردنیان بە ڕێژەیەکی گەورە بە دڵسۆزیو هۆشیاری.

بەو شێوەیەی کە هەل نەڕەخسێنێ بۆ شەمشەمەکوێرە دەروون نەخۆشەکان کە نەخۆشییە دەروونییەکانیو بەرژەوەندییە خۆویستەکانی خۆی بڵاوبکاتەوە کە گیانو عەقڵ بە جارێك ئەڕووخێنێو لەگەڵ دەستبەسەراگرتنی داهاتەکان لە لایەن ستەمکارانو رووخانی ژیانی گشتیی کەواتە سەیر نییە توندوتیژیو تاوان لەو کۆمەڵگایەدا هەر نەبێت یاخود بەرەو نەمان بچێتو هەست بە ئاسەوارەکانی ئاسایش بکرێت لە هەموو دیاردەکانی ژیانی شارو لادێی ئەو دوورگەیەدا.

بەیدەبای دانا وتی: (ئیبن بەتوتە)ی گەرۆکی ناودار بۆی باسکردین کە روونو ئاشکرایە کاریگەریی بانگەوازو فێرکردنی بەهاو خووڕەوشتی پەسەندبە تەنیشت راگەیاندنێکی سەربەستی پاکی سەربەخۆ یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتوویی بڕیارو هەڵبژاردنەکانی گەلەکە دەرئەنجام بڕیارێك دەردەچێت کە بەڕێوەبردنی دەسەڵات ڕێك دەخات هەتا دادپەروەریی جێگیر ئەبێتو داهاتەکان ئەپارێزێتو هانی کارو داهێنان دەکرێتو گیانی یارمەتی گەشەپێ ئەدرێتو ئەمنو ئاشتییو خۆشگوزەرانی بۆ هەمووان فەراهەم دەهێنرێت.

پاشان بەیدەبا دەگێڕێتەوە: کە (ئیبن بەتوتە)ی پیری شکۆمەند زۆر بەختەوەر بووە بەو ڕۆژانەی لە دوورگەدا بەسەری بردووە، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ڕێزی خەڵکەکەیو خووڕەوشتی بەرزو پاکی هەڵسوکەوتیانو پاکیی شارو وڵاتیانو جوانی سروشتی کە خۆیان ئەیانپاراستو نەخشەیان بۆ ئەکێشا، چونکە هەموو خاوەنی بوونو هاوبەش بوون لە خۆییو بەروبوومەکانیداو لە ڕێگاو بانەکانیان خەفەنە ئەبوویت لە بەر بێ سەروبەریو قەڵەبالغی کەسو تووشی بەڵاو نەخۆشی نەئەبوو، بە هۆی پڕە دووکەڵی پیشەسازییەکانو پاشەڕۆکە کیمیاییەکان.

بەیدەبا وتی: لەگەڵ هەموو ئەوانەدا شێخی گەڕۆك پێی ئەوتم دوورگەی بیناسازان لە ڕاستیدا بە پێی سروشت جیاوازی نییە لەگەڵ شوێنانی تر، چونکە بە هەمان شێوە بەهرەمەندە بەو جوانیو داهاتانەی کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە زۆر وڵاتی تریش گەرچی لە شێوەو داهاتەکانیدا جیاوازییان هەیە لە ڕەنگو جۆرو هەڵکەوتنو تێرو پڕیدا.

لە ڕاستیدا ئەو جیاوازییەی کە دوورگەی پێ جیا ئەکردەوە لە هاو وێنەی وڵاتانی شارستانی وەك خۆی ـ وەك ئیبن بەتوتە باسی ئەکات ـ زەمینە نەبوو، بەڵکو دانیشتووانەکەی بوو کە بەهرەمەند بوون بە پەروەردەو فێرکردنو بیروبۆچوونێکی گشتگیرانەوە بە نەریتو بەهای بەرز کە ڕەفتارو تواناو دامو دەزگاکانیان لەسەر پێکئەهێنا کە ڕێزی مافەکانی مرۆڤی تێدا ڕەچاو بکات بۆ ژیانێکی ئاسوودەو بەرزو ئازادیی بۆ هەموان کە پێویستییەکانیان بهێننە دی، لێرەدا پیری گەڕۆك (ئیبن بەتوتە) لەسەر باسەکەی خۆی وەستاو بانگی خزمەتکارەکەی کرد هەندێك خورماو شەربەتی گوڵاوی بۆ هێناین وەك باوو نەریتی قەومەکەی لە ڕێزگرتنی میوانداریێتیو هەستی خۆشەویسیو ڕێزلێنانو هاودەمی بۆ دەربڕین بە تایبەتی تێگەیشتبوون لەوەی کە ڕێبوارێکی نامۆ هەس بە غەریبی دەکاتو پێویستی بە سۆزو یارمەتی هەیە لەبەر دوور لە ماڵو کەسوکارو هاوەڵان بەیدەبا وتی: وتم سوپاست دەکەم بۆ ئەم ڕێزگرتنەتان لێت ناشارمەوە من لەم دانیشتنەتدا لام ئەکردەوە بە لای ڕاستو چەپمدا سوپاس بۆ خوا شتێکم نەبینی لای جەنابت کە لە نێوان خەڵکی ئەم ڕۆژگارەدا باوەو داناو پزیشکان بە رووخێنەری تەندروستی ناوی ئەبەن ئەویش جگەرە کێشانە کە ماددەکەی لە چەند شێوەیەك دروس ئەکەن زۆرینەی لە گەڵای توتن کە گەڵاکەی بەدەمی خۆیان ئەسووتێننو دووکەڵە سووتاوەکەشی بە دەمو لووت هەڵئەمژن لە

ئەنجامی ئەوەشدا ئەو کاربۆنە سووتاوە ئەچێتە سییەکانیانەوە کە ڕەشی ئەکاتەوە بۆریچکە هەواییەکان ئەگرێت.

وەکو دەزانیت لەسەر شێوەی جگەرە یا نێرگەلە بەکاری ئەهێنن‌و گێلانە هونەر بەکار ئەهێنن لە دروستکردنی ئەم جۆرە ئامێرانەداو لە دانیشتنەکانیاندا ئەیگێڕن‌و شەوی پێ ئەبەنە سەرو زەهرەکەی هەڵئەمژن بە سنگ‌و لووتیان‌و مەجلیس‌و شوێنی کارو دەوروبەریانی پێ پیس ئەکەن‌و کەسانی تریش ئەگەر وەکو خۆیان نەیکێشێت بە شێتی ئەزانن.

شێخی گەورە (ئیبن بەتوتە) وتی: خوا لێت ببورێت ئەی بەیدەبا، ئایا بە خەیاڵتدا هاتووە من ئەوەندە نەفام‌و بێ مێشك بم، گەشیارێکی وەك من پێویستە بزانێت جگەرەکێشان‌و ئاسەوارەکەی کە نەخۆشییە کوشندەکانی سنگی لێ دەکەوێتەوە وەك شێرپەنجە کە لەو ماددە کاربۆنە سووتاوە زەهراویە پەیدا دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا نەفامەکانە ماڵی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن، لە پاداشتی ئەو هەموو زیانە تەندروستییە.

ئەی بەیدەبا بزانە لە کاتێکدا ئەم دیاردە ترسناکە زیاندازە بەربڵاوە دەبینی لە کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان بزانە لەوەش خراپتر هەیە ئەویش بڵاوبوونەوەی (أدمان)و راهاتن لەسەر ماددە سڕکەرەکانەو لێك هەڵوەشانەوەی خێزانی‌و کۆمەڵایەتی بە هۆی تەڵاق‌و مانەوە بەبێ هاوسەریی لە کلاێکدا ئەم هەموو کارەساتەو سامناکتریش پەیدادەبێت لە کۆمەڵگادا هەمووی بە هۆی کەم هۆشیاریی‌و دۆڕاندنی خێزان‌و خوێندنگاو راگەیاندن لە بەجێهێنانی کارو رۆڵیاندا ئەمانە هەموو راستین ئەگەر چی ئەو کۆمەڵگایانە بیانەوێ راستییەکان بشێوێنن‌و ئینکاری نەخۆشییەکانی خۆیان بکەن.

بەیدەبا دەڵێت: لەم کاتەدا مامۆستای گەڕۆك کە لە بیرەوەرییەکانیدا نقوم بووبوو، پاشان لایکردەوە بەلای منداو وتی: با بۆت دوپات بکەمەوە ئەی بەیدەبا پێویستە لەسەر هەموو گەل‌و نەتەوەکان پەروەردەو فێرکردن لە پێش هەموو بایەخێکیانەوە بێت جێی گرنگی پێدانیان بێت، نابێت تەنیا لە فێرکردندا سەرکەوتووبن، بەڵێ پەیداکردنی بژێویی ژیان‌و توانای جێبەجێکردنی کارو بەرکارهێنانی داهاتەکان خاڵێکی پێویستەو گرنگە بەڵام بە تەنیا ئەوانە بس نییە، بەڵکو پێویستە پەروەردەی لەگەڵدا بێت، چونکە ئەو ئامێرو کەرەستانە ئەگەر خۆیی‌و مەبەستەکانی بە باشی بەکار نەهێنرێن بێگومان ئو کاتە ئەبنە

ئامێرێکی شەڕو کاولکاریی، بەڵام بە هۆکارێکی بەهێزترو پەلەترو وێرانتر ئەوەی لەم سەردەمەدا ئەیبینین لە لێك هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتیی‌و تیاچوونیی رەوشت‌و بڵاوبوونەوەی جەنگ‌و کوشتارو کێشە لە نێوان گەل‌و نەتەوەکاندا، کە بە دەستی خۆیان ئامێرەکانی جەنگ‌و کوشتارو کاولکاریی دروست ئەکەن.

ئەی بەیدەبا، ئەمە حاڵی ئەو گەلانەیە کە لە فێربووندت سەرکەوتوو بوون، بڵام لە پەروەردەدا دۆڕاون، خراپتریش لەوە ئەو میللەتانەن کە لە پەروەردەو فێرکردندا وەك یەك سەرنەکەوتوو بوون. ئەی بەیدەب، گران نییە ئەگەر تێبگەیت لە نەتەوەیەك‌و بزانیت سەرکەوتووە لە فێرکردندا یان نا؟ لەبەر ئەوەی توانای گەنجەکانی بە ئاسانیی دەردەکەوێت لە لێهاتن‌و داهێنانی کارو بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان‌و کەمی بێ کارە لە کۆمەڵگاکانیدا، بەڵام وردو گرنگتر هەڵسەنگاندنی پەروەردەی سەرکەوتووانەیە، ئەمەش وەکو بۆم باسکردیت ئەتوانیت بەرجەستەی بکەیت لە راستی رەفتارو رەوشتی گەنجەکانیداو پێگەیشتووییان لەگەڵ سۆزو خۆشەویستییان بۆ خێرو چاکەو دادپەروەریی‌و بەرپرسیارێتی‌و نرخاندنی بەرژەوەندیی گشتییان.

ئەی بەیدەبا، من نازانم کام جۆری پەروەردەیە لای ئەو گەلانە کە ژمارەیەکی زۆری گەنجەکانی ئەکاتە قوربانی ماددە سڕکەرو سەرخۆشەکان! کە زەرەرو زیانەکانی لە کەس شاراوە نییە، تەنیا بە زیانی جەستەییش ناوەستێتەوە کە دەست دەگرێت بەسەر ئەندامە سەرەکیەکانی مرۆڤدا وەك مێشك‌و دڵ‌و جگە، بەڵکو لەوەش سامنکتر زەرەرو رووخاندنی هێزی ئەقڵی‌و دەروونیی‌و کۆمەڵایەتیی‌و ئایینیی بە دواوەیە لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەوەی کە ئەی بینین‌و ئەی بیسین بێ هۆشیاریی‌و وریی زاڵ ئەبێت بەسەر لاواندا، ئەیانبینی چۆن نقومبوون لە ناو ئەم فەوتێنەرانەدا کە تەندروسیان بە هیلاکا دەبات‌و بە بەرچاوی خۆیانەوە دەس ئەگرێت بەسەر لاوێتییانداو دایان ئەڕنێت لە هەر هۆشیاریی‌و وردبینییەك‌و رەچاوکردنی چارەنووس‌و پاشەڕۆژو هەستی لێپرسینەوە، بەڵام وەکو باسمکرد نموونەی ئەمانە ناکەوێتەوەو بڵاو نابێتەوە لە نێوان لاوانی نەتەوەیەکدا کە هەوڵی خۆی دابێت‌و ئەرکی خۆی بەجێ هێنابێت بۆ رۆشنبیرکردن‌و پەروەردەکردنی گەلەکەی‌و بیکاتە بنەمایەکی سەرەکی بۆ گەشەپێدانی نەوەکانی‌و چاودێریکردنی کوڕان‌و کچانی.

ئەی بەیدەبا، نەخۆشی جگەرەکێشان ئەبێتە هۆی پێوەنووسانی ئەو کاربۆنە رەشە سووتاوە بە بۆریچکەی سییەکای کەسێکی جگەرەکێش‌و هەر نەخۆشییەکی تریش کە لە

شێوەی ئەودا بێت لە نەخۆشییەکانی راهاتن لەسەر مادده سەرخۆشکەرو سڕکەرەکانو بە تەنیشت نەخۆشییە جەستەییەکانیش نەخۆشییەکانی دەروونییو کۆئەندامی دەمار (ئەعصاب)و کۆمەڵایەتیی دروست دەبن، کە لە راستیدا وەك ئەو هەورە رەشە وایە کە مەرگو فەوتانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووەو پڕیەتی لە بروسکەی سووتێنەرو بەر هەرچییەك بکەوێت لە ناوی دەبات، پاراستنیش لەم هەورە بروسکانەو لەم نەریتە خراپانە نییە مەگەر بە دورکەوتنەوە لێیو دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو رێگایانەی کە پەی پێ ئەباتو پەل ئەکێشێت بۆی، ئەو نەتەوەو گەلانەی کە پەروەردەیان باش نییە بۆ نەوەکانیان بە تەنیا زانستو فێربوون کەلکی ناگرێت، چونکە پشتگوێخستنی پەروەردەو هۆشیاری نەکردنەوەیان قورسرین زیانو بەڵاو لادانی رەوشتییو تەندروستییو کۆمەڵایەتیی بە دواوەیە.

بەیدەبا لە کاتێکدا بیرەوەرییەکانی ئەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کاتانەی لە نێوان خۆییو (ئیبن بەتوتە)دا ئاخاوتنو قسەو باس کراوە دەڵێت: پیری گەڕۆك هەر چییەکی بگێڕایەتەوە راستی ئەکرد هەروەکو پاڵەوانی چیرۆکی (ألف لیلە و لیلە)ی کەلەپووری گەڕۆکی بیەناوبانگ سندباد هەمان شت ئەگێڕێتەوەو باس لەوە دەکات کە چۆن (ئیبن بەتوتە) خۆشحاڵ بووە بە سەردانی دوورگەی بیناسازانو هەمان راو بۆچوونیان هەبووە دەربارەی نیزامی دوورگەو دانیشتووانەکەی کە جێگای سەرسووڕمانیان بوو کە نهێنی سەرکەوتنی تاكو نەتەوەکان لە جۆری کەسێی ئەو تاکانەدا یان ئەو هاوولاتیەدا خۆی دەبینێتەوە، لەسەر هەر نەتەوەیەك پێویستە بەرەو ئایندەیەکی رۆشن هەنگاو بنێت کە مرۆڤ تیایدا کامەران بێتو هاوولاتی تیایدا سەربەرز بێتو پێویستە لەسەری بڕوانێت چۆن رۆڵەکانی پەروەردە بکاتو کام بیرو بۆچوونێکی گشتگیریان پێشکەش بکاتو کام پەروەرشی دەروونیو رەوشتییان بۆ فەراهەم بێنێتو کام تواناو دەروازەی زانستییانەیان بۆ فەراهەم بێنێتو کام راگەیاندنی پاكو راستگۆیان بۆ ئامادە بکات کە راستییەکانیان پێ نیشان بداتو کام دامودەزگا کە چاودێریی بەرژەوەندییەکانیان بکاتو کام دەستوورو یاسا کە دادپەروەرییو یەکسانییو هاودەمیی لە نێوانیاندا بەدی بهێنێت.

بەیدەبای فەیلەسووف وتی: لەم کاتەداو بەم وردەکاریو تێبینییە زیرەکانەی دەربارەی دوورگەی بیناسازانو ئەو پەندو سەیرو سەمەرانەی کە تیایدا بەدی کردبوو زانای گەورەی گەڕۆك (ئیبن بەتوتە) لە قسەکانی بوویەوە، بەڵام من نەمویست وازی لێ بهێنم هەتا ئەو

پرسیارەی لیٚ نەکەم دەربارەی خالیٚکی گرنگ کە بۆی باس نەکردبووم‌و رای ئەوم تیادا نەبیستبوو لە نیٚوان ئەو شتانەی کە لەو دوورگە جوانەدا دیتبووی.

پیٚم وت: برای گەڕۆکی دانام، زۆر لە گەورەیی‌و وانیی کاروبارەکانی دوورگەت بۆ باسکردم، بەلاّم تۆ باسی دوو کاری گرنگت نەکرد، کە حەز ئەکەم لە تۆوە بیبیستم دەربارەی ئەو ولاّتە جوانە.

مامۆستای گەڕۆك (ئیبن بەتوتە) وتی: ئەمڕۆ با بەس بیٚت لە بارەی بیروڕای دوورگەو دامودەزگاو سیفەتەکانیان کە سەرچاوەیان دەگەڕیٚتەوە بۆ بایەخپیٚدانی ئەرکەکانی پەروەردەو بانگەوازو راگەیاندن.

دەستی لیٚ هەلّبگرەو چیت پیٚ گرنگە بۆ بەیانی تەواوی دەکەین، دانایەکی ئەزموونکاری وەك تۆ ئەی بەیدەبا پرسیار ناکا مەگەر لە شتیٚکی سامناك‌و کاریٚکی زۆر گەورە نەبیٚت.

# بولبولی ئلزاد لە بەرە بەیاندا دەخوێنێت

بۆ رۆژی دوایی بەیدەبا خەریك بوو شوێنی خۆی لە مەجلیسەکەی (ئیبن بەتوتەدا بگرێت، هەتا شێخ پێشی کەوت کە لەو کاتەدا کوپێك گوڵاوی بە سیوودو بۆن خۆشی ئەنۆشی بە دەم پێکەنینەوە هەواڵی ئەو دوو کارە گرنگەی پرسی کە مێشکی بەیدەبای پێوە خەریکەو پێشتر باسی نەکردووە لە بارەی دوورگەی بیناسازانو خەڵکەکەیو وتی: ئەو دوو شتە چییە کەفەیلەسووفێکی دانای وەك تۆی خەریك کردووە ئەی بەیدەبا؟

بەیدەبا لە وەڵامدا وتی: مامۆستای گەورە خاڵی یەکەم بریتییە لە ئازادی کە جەنابتان بۆت باس نەکردووین، با لەوێوە دەست پێ بکەین، دەربارەی سەربەستییو ئازادیی لە ناو دوورگەدا ئازادیی مانای چی دەگەیەنێت لای ئەوانو چۆن راهێنراون لەسەری؟ لە کاتێکدا ئازادی لە ئالۆزترین گرفتەکانە کە زۆر رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان پێوەی خەریکنو زۆر لە وڵاتان کێشەیانە.

گەورەم لەم وڵاتانەو لە سەردەمی ئێمەدا هەیە ئازادی ئەوەندە رەها دەکات هەتا نزیك ئەبێتەوە لە گەندەڵییو لە دەستچوونی خووڕەوشتەکان بە شێوەیەك کەسایەتی هەڵئەوەشێنێتەوە، سروشتەکان ئەشێوێنرێنو لە ناو بەرەکان حەڵاڵ ئەکرێن. هەشیانە ئەوەندە فشار ئەخەنە سەر هاووڵاتیان وەکو منداڵێك کە هیچ بەرژەوەندییەکی خۆی نەزانێت، کەمێکیانکە بە پوختەو هەڵبژێراوی ئەوانی تر ناسراونو خۆیان بە راسپێراوی خەڵکبی ئەزانن بۆ کەس نییە هەناسە هەڵبکێشێت مەگەر بە ویستو ئیزنی ئەوان نەبێت.

کەواتە بارودۆخلەم وڵاتانەدا چۆنە؟ ئەوانە چۆن رەفتار ئەکەن لەگەڵ خۆیانداو بڕیارو هەڵسوکەوتو خواستو ویستیان چۆن دەبێت، ئایا چارەسەرێکیان بۆ ئەم گرێیە دۆزیوەتەوە؟ ئایا دوورکەوتوونەتەوە لە زیانەکانی گێرەشێوییو رزگاریان بووە لە زیانەکانی زوڵمو زۆری؟

گەورەم حەز دەکەم ئەوەی دیوتەو بیستووتە لە بارەی ئازادیی لەو وڵاتەدا لە خۆتی ببیستم، بەڵکو ئێمەش هەندێك چارەسەری لێوە بدۆزینەوە کە لەگەڵ کارو باری خەڵکیدا بگونجێتو رێکیو چاکسازیی پێ بەدی بهێنرێت.

بەیدەبا وتی: شێخ (ئیبن بەتوتە) بە بیرکردنەوەو تێڕامانەوە سەیرێکی کردمو پێی وتم: پرسیاری شتێکی گەورەت کرد کە زۆربەی وڵاتانو خەڵکیی لە جیهانی ئادەمیزاددا پێویسیان بەوە هەیە لێی تێبگەنو بە شوێنیدا بگەڕێن هەتا مافی سەرەکی ژیان بپارێزن،

مانای ژیان‌و مەبەست لە بوونیدا، پێویستە ئەو تێگەشتنەش لە قەناعەت‌و دڵنیاییەوە هەڵقوڵێت هەتا رێکیی‌و هاوسەنگیی لە ژیانی خەڵکیدا دابین بکرێت‌و رەفتارو هەڵسوکەوتیان کامڵ‌و پێگەیشتوو بێت، هەتا ببنە بەندەیەکی چاکخوازو لێهاتوو سەرزەمین ئاوەدان بکەنەوەو شتومەکە حەڵاڵکراوەکان بەکاربهێنن وەك چۆن خوای گەورە بڕیاری داوە بۆ نەوەی ئادەمیزاد کە وابن ئەم تێگەیشتنەش بریتییە لە مانای ژیان‌وپێوەری لێپرسینەوە.

بەیدەبا وتی: وتم: راستت کرد ئەی زانای پەندیار، پێم بڵێ ئەم باسە چۆن دەبینیت؟

(ئیبن بەتوتە) لە وەڵامدا وتی: تۆ ئەزانیت ئەی بەیدەبای ژیرو دانا دروستبوون‌و ژیانمان بۆ هەر یەکەمان لەم سەر زەوییەدا بۆ کاتێکی دیاریکراوە، پاشان ئەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگار بۆ ئەوەی مرۆڤ راپۆرتی کارو کردەوەکەی خۆی دابنێت‌و ئەنجامەکەی ببینێتەوەو بزانێت چۆن ئەمانەتەکەی سەرشانی بەجێهێناوە، چونکە ژیان بە خۆڕایی‌و هەڕەمەکیی دروست نەکراوەو ئامانج تیایدا خێرو چاکەیە ئەمەش یەك لە دوای یەك تاك‌و نەوەکان ئەگریچتەوە، هەموو بریتیین لەو خشتە یەك بە دوای یەکانەی کە بەشدارن لە دروستکردنی ئاوەدانیی زەوی، مەبەستیش لە هەڵگرتنی ئەمانەت‌و جێنشینەییەکەی دروست، واتە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بەو جوانیی‌و رێکییەی کە بوونەوەری پێ دروستکراوە لە جوانیی‌و کارسازیی بەرەو تێرو تەسەلی‌و گونجاوی‌و هاوسەنگی‌و رێك‌و پێکی بۆ ئەوەی هەق‌و دادپەروەریی‌و دەستەبەریی‌و میهرەبانیی‌و ئاشتیی زاڵ بێت‌و بە پێچەوانەوە شەڕو خراپە نەمێنێت‌و هەر سیفەتێکیش بە دوای ئەودا کە ئەبێتە هۆی سیتەمکاریی‌و شەڕەنگێزیی‌و ماف خواردن‌و نەمانی لێپرسینەوە، ئەی بەیدەبا ئایا وەك من نابینی کە مانای ئاوەدانیی‌و شارستانیی‌و مانای جێنشینی‌و موسەخەرکردن هەر ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بەدی ئەهێنێت لەسەر زەویدا، لە زانست‌و زانیاریی‌و داهێنان؟

ئایا سوودی خەڵکی تێدا نییە ئەوەی کە لە مانگان‌و ساڵاندا ئەیبڕن اە ساتەکاندا بیبڕن؟

ئایا کەڵکی خەڵکی‌و دروستکراوەکانی تر نییە بەرهەڵستی ئەو نەخۆشیانە بکرێت کە دەست ئەگرێت بەسەر هەزاران‌و ملیۆنان؟

ئەی بەیدەبا، مەبەست لە ژیریی‌و زانست‌و ئاوەدانیی بریتییە لە بەکارهێنان‌و بەدەسێنانی شتە سوودمەندو باشەکانە بۆ خەڵکی، لەبەر ئەوە هەوڵدان بە پێی زانست‌و ژیریی بۆ ئاوەدانکردنەوە ئامانجی خەڵکییە مادەم سوودی ئەوانی تێدایەو بەرەو خێرو چاکەیان دەبات، ئەو هۆکارەشی کە سوودەکان موسەخەر دەکات‌و ئاسانی دەکات بۆ خەڵکی

ئەوە پاداستی ماددی لە دونیا دەس دەکەوێتو پاداشتی گەورەی گیانیش لە پاشەڕۆژدا، ئەمەش لە کاتێکدا ئەی بەیدەبا ماوەی ژیانمان کۆتایی پێ دێتو ئەنجامی کارو کردەوەکانی خۆمان ئەبینێنەوە ئەو کاتە ئەزانین ئێمە لە ژیانی دونیا لە کام بەش بووین (أَحسَنُ عَمَلاً)، (ئیبن بەتوتە) وتی: بەڵێ ئەی دانای پەندیاردیتم رۆڵەکانی ئەو دوورگەیە لە مانای تەواوی ژیان تێگەیشتوونو مانای تەواوی ئازادی لە کۆمەڵگەکەیاندا، لەو شێوازەی کە وردیاەکانیان لەسەر پەروەردەکردووەو رایان هێناون لەسەری، چاکەو خۆشگوزەرانیان بۆ خۆیان فەراهەم هێناوە، ئەگەر خستنەگەڕی ئەقڵو باشی بەکارهێنانی ئازادی نەبوایە ئەی بەیدەبا نەیانئەتوانی شارستانیو ئاوەدانی لە جیهانەکەیاندادروس بکەن بەو شێوە باشەی پێشکەشیان کردووە کەواتە داماوی بۆ ئەو کەسەیە کە عەقڵ پووچەڵ ئەکاتەوەو ئازادی ئەخنکێنێتو داهێنانو نوێخوازی ئەکوژێت ئەی بەیدەبا سەربەستیی لای خەڵکی ئەو دوورگەیە مەبەستی بێ سەرو بەریی‌و لە یەك ترازانو شوێنکەوتەی رابورادنو گومڕایی نییە کەوا مافەکانی تێدا دەفەوتێتو رێزو لێپرسینەوەی تیا نامێنێتو زەرەرو زیان بە خۆیانو کۆمەڵگاکەیان ئەهێنن هەر لە سەرەتاوە یان بە پاشەڕۆژی نەوەکانیان ئەی بەیدەبا مانای ژیانو سەربەستی لای هاووڵاتیانی ئەو دوورگەیەکردنی کاری هەڵە نییە یا تووشی خراپەکاریی‌و لادان بنو بکەونە ناو کاری فەوتێنەرو کوشندەکان، ئەمە سەربەستی نییە لە یاساو نەرتی ئەواندا، بەڵکو نەفامییە، کەمو کوڕییەو دواکەوتنە، لەبەر ئەوە سەربەستیی‌و ئازادیی لای ئەوان جەوهەری ژیانو ژیرییە کە بریتییە لە مافێکی پیرۆز بە پێچەوانەی ئەو واتا گەندەڵە سەبارەت بە ئازادیی کە بە مانای گێرەشێویی‌و سەرگەردانیی‌و هەڵوەشانەوەی هەموو بەهاو نەریتەکان دێت بە واتایەکی ئاژەڵانە کە هیچ ماناو مەبەسێك لە ژیانیدا نەبێت لە بیرۆکەی ماددەیەکی رووتدا بمێنێتەوەو ئەوەی بەرجەستە نەبێتو هەستیارەکانی پێ نەگەن پەی پێ نەبات، یا ئارەزووەکانی بەکار بهێنێت بەبێ لێپرسینەوە، بەهایەك، یان رێکخەرێکی خووڕەوشتیی، یان بەبێ هەڵگرتنی ئەمانەتو بەرپرسیارێتی.

ئازادی لای ژیرو خاوەن خووڕەوشتە بەرزەکان بریتیی نییە لە مافی زیانگەیاندنو خراپەکاریی‌و بڵاوکردنەوەی لەناوبەرەکانو سووکایەتیپێکردن، بەڵکو ئازادیی لای ئەوان بریتییە لە مافی بڵاوکردنەوەی چاکەو چاکخوازیی‌و کردەوەی راستو پاراستنی مافەکانو هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی‌و بڵاوکردنەوەی نەریتی پەسەندو دادپەروەریی‌و دڵسۆزیی کردن بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە جەماوەری شورای کۆمەڵگا بە باشو سوودمەند لە

قەڵەمیان داوەو دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەوانەی کە جەماوەیر راوێژکاریی بە خراپو زیاندار دایان ناوە.

بەیدەبا وتی: وتم بە ئیبن بەتوتەی دانا ئایا ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێت کە کۆمەڵگای دوورگەو رۆڵەکانی دۆڵی ئاشتیخوازان بێ ئاگان لە کردنی هەڵەو کەوتنە ناو تاوانو کارە لەناوبەرەکان ئەی مامۆستای گەورەمان؟

بەیدەبا وتی: پیری گەڕۆك سەیرێکی گلەیی‌و سەرزەنشتانەی لێکردم وتی: تۆ باشتر ئەزانیت ئەی بەیدەبای فەیلەسوف هیچ کۆمەڵێك، یان دروستکراوێك نییە بێگەرد بێت لە هەڵەو کەوتنە ناو تاوانەکان مەگەر کەسێك پەروەردگار بێ گوناه دروستی کردبێت ئەوانەش کەمنو پێوەر ناکرێت، خوا وەك ئەوان چاکت بۆ بکات، کەوتنە ناو هەڵەو تاوانو خراپەکاریی بەبێ مەبەست یا لە ساتی لاوازیی‌و بێ ئاگاییداشتێکی ئاساییەو هەر بووە هەتا لەسەر ژیرترین پەندیارو داناش، بەڵام بەندەی چاك ئەگەر نەفس لە خشتەی برد ـ هەرچەند بە کەمیش رووئەدات ـ کەوتە ناو تاوانی بچووکەوەو زۆرجار بە کتوپڕیی‌و ترس، یا شەرمو دوو دڵییەوە رووئەدات، چونکە ئەزانێت ئەوە هەڵەیەو پێویستە لە هەڵەکەی پاشگەز بێتەوە، ئەگەر بەو نزیکانە تێی کەوت، چونکە دەروونێکی گەورە پێداناگرێت لەسەر تاوانو ئارەزووی نییە لەسەری‌و حەز بە ئاشراکردنی ناکات، هەروەها سوور نییە لەسەر کاری دڕندەیی‌و فەوتێنەر ئەگەر کەوتە ناو شتێکیش لەوانە.

پێداگرتنو ئاشکراکردنو بڵاوکردنەوەی تاوانو کارە ناشیرینەکانی ئەوە گەورەترین خراپەیەو زیانەکەی گشتگیرو بڵاوترەو ئازارەکانی ئەگات بە هەموو خەڵکی، بانگەشەیە بۆ بێ سەروبەریی‌و رێگایەکە بۆ رووخانو لادان لە رێگای راستو لە دەستچوونی مافو ئەرکەکان.

دووپاتی ئەکەمەوە ئەی بەیدەبا لە کاریگەریی ئەم رەفتارانەو دیاردە نزمانە ئەگەر وازی لێ بهێنرێ ئەیوا خراپترین شوێنەوارو رەنگدانەوەی هەیە لەسەر سادەو بێ ئاگایان لە منداڵو مێرد منداڵەکان.

بەیدەبا وتی: مامۆستا ئەمە مانای وایە پێویستە لەسەر دەوڵەت هەوڵ بدات بۆ پارێزگاریی کۆمەڵگاو دارو دەستەی توندو تۆڵ بکات بۆ زانینی ئەوەی خەڵکی ئەنجامی دەدەن، تەنانەت ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە کارە تایبەتییەکانیشیانەوەو نهێنیی‌و شتە شاراوەکانیان لە خراپەکاریی‌و تاوان دەرچات لە کاتێکدا ئەکەونە ناوی.

لەم قسانەدا بووین مامۆستا لە مەجلیسەکە هەستایەوە کە لە رووخساریدا کاریگەریی ئەو قسانەی پێوە دیاربوو، بە نەرمی سەیرێکی بەیدەبای کرد، هەروەکو شتێك لە خەیاڵیدا بوو، لەم بارە سامناکەوە بە بەیدەبا بڵێت، لەبەر ئەوە رووی تێکردو وتی: ئەوەی ئاماژەت پێکرد لە بارەی کۆکردنەوەی سەربازو دارو دەستە لە لایەن دەسەڵاتەکانی کۆمەڵگاوە بۆ زانینی هەموو ئەو کارانەی کە خەڵکی ئەیکەنو جەختکردن لەسەر خووڕەوشت لە کۆمەڵگادا خۆی لە خۆیدا کارێکی هەڵەیە کە زۆربەی کۆمەڵەکان تێی ئەکەون، لە سەرەتادا بە نیەت چاکی دێت، بەڵام ئەم جۆرە مومارەسەیە لە راستیدا هەڵەیەو کە بە رووخانی واتاو گیانی کۆمەڵگا کۆتایی دێتو جێگرتنەوەی زەوتکردنو دیکتاتۆریی لە کۆمەڵگادا.

گرنگترین خاڵ کە پێویستە کۆمەڵگاکان سوور بن لەسەری بۆ ئەوەی بە راستیی کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتیی بن ئەویش هەستکردنە بە ئەمنو ئاسایش، چونکە ئەگەر ئەو هەستە لە هەر کۆمەڵگایەکدا بزر بوو، ئەوا پێی بڵێ خوا عەفووی بکات.

ئەی بەیدەبا، مافی هیچ کەسێك نییە سیخوڕیی بکات بەسەر ماڵو شتە تایبەتییەکانی خەڵکەوە، چونکە لە هەر جێگایەکدا ئەم جۆرە کارانەی وەك وردبینیو دزەکردنە ناو کارو بارە تایبەتییەکان هەبوو، هەستکردن بە ئاساییش ناهێڵێت، هەروەها پاراستنی خووڕەوشت لە کۆمەڵگادا بەم جۆرە کارانە سەر ناگرێت، بەڵکو بەرامبەر ئاشکراکردنو بڵاوکردنەوەی خراپەکاریی و کارە لەناوبەرەکان دەکرێت کە خراپەکاران خۆیانو گەندەڵییەکانیان ئەسەپێنن بەسەر خەڵکیدا بە ئاشکراکردنو بانگەشەکردنی، هەروەها کەم تەمەنەکانیان هەڵ ئەخەڵەتێننو روو ئەکەنە هەواو ئارەزووی خۆیان بەبێ هیچ ئاوڕدانو ئاگابوونەوەیەك لە مافی خەڵکیو پاشەڕۆژو دەرەنجامی کارەکانیان، دەبێت ئاسایشی کۆمەڵایەتییش بەرگیریی ئەم جۆرە کارانە بکاتو ئەم بەرهەڵستییەش بریتییە لە فەرمان بە چاکەو بەرگریی لە خراپە کە لە گرنگترین راگرەکانی ئەمنو ئاسایشی کۆمەڵایەتییەو پارێزگاریی ئازادییەکانە لە کۆمەڵگادا.

بەڵام سیخوڕیی لە لایەن دەسەڵاتەوە لەسەر کاروباری تایبەتیو رێزی ماڵی خەڵکی یەکێکە لە هۆکارەکانی دەستبەسەراگرتنو زەوتکردنو تۆقاندنی خەڵکییە کە ئەوەش گەندەڵی دەسەڵاتو لەدەسچوونی ئازادییو ئاسایشی تێدایە لەگەڵ رووخانی مانای کۆمەڵگا.

کەواتە وردکردنەوەی خەڵکیو سیخوڕیی بەسەریانەوە کاری دەسەڵاتە مایە پووچەکانە کە پەنا دەبات بۆ هۆکاری تۆقاندن کە ئیرادەی کۆمەڵگا ئەبەزێنێت.

ئەی بەیدەبا، گەورەترین هۆکاری سەرکەوتووانە لە چارەسەری خووڕەوشتو تایبەتمەندییەکانی خڵکیو کاریگەریرینیان بریتییە لە پەروەردەکردنو ئەوەی ئەیچێنی لە ناخیاندا لە بیرو باوەڕو بنەمای بەرز نەك بە زەبری دارو قامچی، چونکە سیخوڕییو زەبرو زەنگ رەوشتی بەرزو دەروونی پاك دروست ناکات، بەڵکو لە هەمان کاتدا ترسو درۆو دووڕوویی لەگەڵ رۆچوونە ناو لادانوخراپەکاری بەجیٚ ئەهێڵێت.

تاوان کردنیش پێویستیی بە بەڵگەو دەلیل هەیە، نەك بە سیخوڕیو گەڕان بە شوێن نهێنیو شتە شاراوەکانی خڵکیداو لە هەمان کاتیشدا یاسای سزادانو شکاندن هۆیەکی گرنگە لە هۆکارەکانی بەرگیرییو نەهێشتنی تاوان، هەروەها سنوورێکە بۆ شەڕەنگێزییو دەستدرێژیی، ئەمەش بۆ پاراستنی ئەمنو ئاسایشی کۆمەڵایەتییو پارێزگاریی لە خوێنو مافەکان.

ئومێدەوارم ئەی بەیدەبا ئەو خاڵەم بۆ روون کردبیتەوە لەگەڵ مانای ئاسایشی کۆمەڵایەتییو جیاوازیی نێوان هەڵخلیسکانو کەوتنە ناو نەفسی پیسو ئارەزوو و هەواکانیو نێوان تاوانی دەستدرێژیی کردنە سەر مافوماڵو گیانو واتای هەر یەکێکیان ئەگەڕێتەوە بۆ شێوازی ئەو هەڵسوکەوتە لەگەڵ لایەنی خووڕەوشو مومارەسەی رەوشت لە کۆمەڵگاداو کە چۆن پەروەردە لەم بوارەدا بناغەو هێڵی بەرگریی یەکەمە کە بەبیٚ پەروەردەو یاساو سزادانو هەڕەشەکردن سوودێکی ئەوتۆی نییە، هەروەها دزەکردنو سیخوڕیو خراپیەکانیان جگە لە زەرەرو زیان هیچ بەرهەم ناهێنێت، هەروەها ـ بە تەنیشت پەروەردەوە ـ ئەو سزای لە بارو گونجاو بە پێی پێویست کاریگەریی هەیە لە بەرهەڵستیکردنی تاوانو بڵاوبوونەوەی هەستی ئەمنو ئاسایشو لە کۆمەڵگادا، کەواتە ئەی بەیدەبا بەم شێوەیە هێمنیو هەستی ئاسایش دەبینی لە کۆمەڵگاداو سزادان ئامانجی کۆمەڵگا بەرزو پێگەیشتووەکان نییە، لەبەر ئەوەش حەددو سزا قورسەکان بە پێی هاتنەدیی هەلو مەرجەکان دیاریکراوە، بەڵام هەر سزایەکی تری خوار ئەوە ئەوەندە بەس بێت بۆ بەرگیری لە تاوانو بەدیهێنانی ئسایش، هەروەها پێویستە پەسەندکراو بێت بە پێی رەزامەندی کۆمەڵگاو لە سنوور دەرنەچێت، کەواتە ئەی بەیدەبا گرنگە بۆ باوانو بەخێوکەران کە منداڵو مێرد منداڵەکانیان ئاگادار بکەنەوە لە کارو کردەوەیانو

کاریگەریی لەسەر دیگەرانو دەوروبەرو بە پەروەردەی رووناکبیرانەو لە ئەقڵیان نزیك ببنەوە، نموونە بهێننەوە لەسەر خۆیانو بە کەسانی خۆشەویسی دەوروبەریان وەك دایكو باوكو براو خوشکانی، ئەگەر کەسێك هەڵەی کرد لە هەقیاندا، چۆن سەیری ئەو کارە بکەنو چۆن هەست بکەن؟

پاکێتیی مەعدەنو بنەمای رەسەنو رەوشت بەرزییو هەست بە لێپرسینەوەو عاقیبەت خێریی لەوەدایە ئەوەی مرۆڤ بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برادەرەکەشی پێی خۆش بێت، ئەم جۆرە چاندنە لە ناخدا هەستی ویژدانو گەورەیی دەروون دروس دەکا بە پاڵنەری رێزی مرۆڤایەتییو رێز لەخۆگرتن ئەم هەستو توندوتۆڵییە بەهێزترو بەردەوام ر دەبێت ـ ئەگەر هەر لە منداڵییەوە تێیدا چێنرا ـ لە هەر هەڕەشەو گوڕەشەیەك، چونکە هەڕەشەو ترساندن بە تەنیا گەنجو مێرد منداڵ بەسەریا ئەڕۆنو باز ئەدەن بە سەریا بە هۆی نەزانیی یا لە بیرچوونەوە بە کارتێکردنی هەوەسو ئارەزوو و رابواردن.

شێخ (ئیبن بەتوتە) لە قسەکانی بەردەوام بوو روویکردە بەیدەباو وتی: ئەی بەیدەبای ژیرو دانا، چاکەخوازییو پەروەردەو راهێنانی دروستو چاك لەناو ناخی هاوولاتیاندا هەستو ویژدان دروست دەکاو هەر کەسێکیش تووشی هەڵە بوو ئەیگەڕێنێتەوە بۆ رێگای راستو خێرو چاکەو کۆمەڵگاکەیان ئەپارێزێ لە سەرلێشێواوییو بڵاوبوونەوەی خراپەکارییو گومڕایی لاوەکان.

بەیدەبا وتی: وتم: راستت وتو راستت پێکا ئەی مامۆستای زانا، کەواتە جیاوازیی لە نێوان ئەوەی کە بە هەڵەدا بچینو لاوازبین بەرامبەر هەڵەکانو لەگەڵ ئەوەی کە بە راشکاوانە بە شوێن رێگای چەوتو زیانبەخشو ناڕەوا بڕۆین، چونکە ئەوەی داوای خراپەکارییو شەڕو زیان دەکات بە مەبەستو زانینی ئەوە پاڵپشتو سەرخەری شەیتانە، دوژمنی ژیانو ئازادییە، ئەو رەفتارەش نە لە ئازادییەوە نە لە خێرو لە راستییەوە نەهاتووە، بەڵکو بریتییە لە داڕووخانو داوکەوتنو بێ سەرو بەرەی بەرەو فەوتاندنی نەتەوەکانو لێك هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگاکانو تیاچوونی شارستانیەکان دەڕوات.

مامۆستا (ئیبن بەتوتە) وتی: ئەی بەیدەبا ئەوەی ئازادیی بەو شێوەیە دەبینێت هەر کەس مافی ئەوەی هەیە هەر چییەك پێی خۆش بوو بیکاتو ئەوەی نەفس بۆی رێك خست بەبێ یاساو رێساو لێپرسینەوەیەك بەبێ لێکدانەوەی ئەنجامو پاشەڕۆژەکەی بە شێوەیەك لە خۆیدا چاکەو خراپە، راستو چەوت، چاکسازییو خراپەکاریی تێکەڵ بکات، ئەوە هیچ بە

دەست ناهێنێت جگە لە دەرستکەوتێکی هەرزانو چێژێکی کەم نەبێت، بریتییەلە گومڕایی‌و سەرلێشێواویی‌و ئاکامەکەی نا لەباریی کارو پەشیمانیی‌و لەدەستچوونە، چونکە هیچ شتێك لەم بوونەوەرەدا نییە کە ڕێکخەرو یاساو بنەمایەکی نەبێت کە سنووری دیاری دەکاتو ڕێڕەوی ژیانی ڕێك بخات، کەواتە هەموو شێك لەم بوونەوەرەدا نیزامێکی دیاریکراوی هەیە بۆ هەر شێك گرنگی‌و مەبەستێك هەیە، ئەوەی کە لە دەوروبەرماندا دروستکراوە بەو جوانیی‌و ڕێکییە بە هەڕەمەکیی‌و خۆڕایی دروست نەکراوە.

بەیدەبا وتی: مامۆستای گەورە ڕاست ئەکەیت، ئەمە حاڵی بوونەوەرە لە هەموو ئەو شتانەی کە تیایدایەتی لە خانەیەکەوە بۆ گەردیلەیەك‌و هەتا گەورەترین‌و بچووکترین شت، بێگومان هەر لادانو گۆڕینێکیش لە یاساو ڕێساکانی چارەنووسی خراپ بوونو تیاچوونە.

مامۆستا (ئیبن بەتوتە) وتی: ئەوەی کە باسی دەکەیت سوننەتی خوای گەورەیە لە بوونەوەردا، بەڵام بەیدەبا ئێستا کاتی گەڕانەوەم نزیك بۆتەوە، حەز دەکەم هەندێك پشوو بدەم، لە دوای ئەو خڵە گرنگانەی باسمان کردو لە مانای ژیانو بوارەکانی‌و ئاکامەکانی.

"ئەو کۆترە نەفامەی دان لە داوی ڕاوکەردا هەڵئەگرێتەوە"

بەیدەبا لە پشکۆیەك گەرمتر بوو، بۆ تامەزرۆیی دیتنی (ئیبن بەتوتە)ی گەڕۆك بۆ ئەوەی ئەو باسانەی لەگەڵدا تەواو بکات کە ڕۆژی پێشوو دەستیان لێ هەڵگرت، هەروەها لە بارەی ئەو شتانەی تریش کە دڵەڕاوکێی بۆ دروستکردبوو، ئارەزوومەند بوو بۆ گوێبیستی ڕاو بۆچوونەکانی مامۆستا لەو بارەیەوە، بەڵکو ئەوەی لێی ونبووە لای ئەو بیدۆزێتەوەو پەی پێ ببات وەك چۆن لە باسەکانی پێشوودا دەربارەی فەلسەفەی ژیان باس‌و توێژینەوەیان لەسەر کرد، بەیدەبا چوو بۆ لای مامۆستا لە کاتێکدا، بە وزەو چالاکانە دانیشتبوو بە رووی خۆش‌و پێکەنیوە سەیرێکی بەیدەبای کردو وتی: ئەبینم خۆت‌و هاوەڵەکانت زوو ئامادەبوون بۆ ئەم دانیشتنەی ئەمڕۆمان، ئەڵێ هێشتا بووە بە خولیای سەرت ئەوەی کە دوێنێ قسەمان لەسەر کرد.

بەیدەبا وتی: بەڵێی گومانەکەت وایە، من زۆر تامەزرۆم بۆ گەیشتن بەو باسانە پێش ئەوەی جەنابت پێ هەڵگری لە وڵاتەکەمان، چونکە بێ هیوا ئەبین لە بینینت جارێکی ترو بێ بەش ئەبین لە سوود وەرگرتنی قسەو حیکمەت‌و شارەزاییەکانت.

ماموستای گەورە لە وەڵامدا وتی: بەڵێ بەیدەبا، ئەوەی کە لە تۆوە بیستم، بیرم لێ کردەوە لە بارەی کارەکانی خوای گەورەو دروسکردنی بوونەوەردا لەسەر شێوەیەکی ڕێکوپێك کە سنوورو ڕێکخەری هەیەو ئیشەکانی پێ بەجێئەهێنێت، ئەگەر ئەو یاساو سنوورانەی خۆی بەزاند ئەو ڕێکخراوە ئەڕووخێتو هەر چۆنێکیش بێت، کەواتە سەبارەت بە مرۆڤو ژیانو بوارەکانی لە کۆمەڵگادا چی بەسەر دێت ئەگەر سنوورەکانی بەزاند، لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤ سنووری ئەم بوارانە بزانێت لەگەڵ بنەماو یاساکانیدا ئەگەرنا ئەوا هەموو لایەنەکانی ژیانو ئاوەدانکردنەوەیو شارستانیەتەکانی ئەڕووخێت.

بەڵێ ئەی بەیدەبا ئەگەر لەوە تێگەیشتین ئەوەی مانای ئازادییو سنوورو یاساکانی نەزانێتو ئەوەی ئازادیی تەواو بە خۆی ئەدات بە هەموو شێوەکانیەوەو بە شوێن هەواو ئارەزوودا بگەڕێت بەبێ سەیرکردنی ئاکامەکەی وەك ئەو پەروانە گێلە وایە کە سەمادەکات لە خۆشی رووناکی بەبێ ئەوەی جیاوازیی بکات لە نێوان رۆشنایی نورو گەرمایی ئاگردا کە چارەنووسەکەی فەوتانو لەناوچوونە، یا نموونەی وەك ئەو کۆترە ساویلکەی لە کورتبینیو بێ ئاگایی خۆی لە کاتێکدا بە شوێن خۆراکدا دەگەڕێت بەبێ ئەوەی بزانێ لە کوێ پەیدای بکاتو چۆن بگەڕێت، ئەچێت دەنکە گەنمەکان لە ناو تۆڕو داوی راوکەردا ئەدۆزێتەوە کە لە سەرچاوەیەکی خراپەوە دێتو چارەنووسەکەی تیاچوونە.

بەیدەبا وتی: راست ئەکەیت ئەی ماموستای شکۆدار کەواتە جیاوازیی لە نێوان کەسێك کە بە هەڵەدا ئەچێتو خۆڕاگر نییە لەگەڵ کەسێك کە بە ئاگاو ئەنقەستەوە هەوڵی شەڕەنگێزییو خراپەکارییو زیانگەیاندن ئەداتو شوێنکەوتووی هەواو هەوەسو ئارەزووەکانێتی، بەبێ هیچ ویژدانو لێپرسینەوەو سەرزەنشتێکی خۆی کە لە راستیدا ئەم جۆرە رەفتارە دوژمنی ژیانو ئازادییە، ئەم کردارو هەڵسوکەوتانە نە لە ئازادییەوە هاتووە نە لە خێرو راستییەوە لە هیچ شتێکیدا، بەڵکو ئاست نزمییەو بێ سەروبەرییو دواکەوتنو رووخانە پێی بزانێت یان نا.

شێخ وتی: بەڵێ ئەی بەیدەبای پەندیار هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا ـ وەکو باسمانکرد ـ بە پێوەرەو یاسایە لەبەر ئەوە سنوورو ڕێکخستنی ئازادیش هەروەك سازکردنو ڕێکخستنی گەردیلەکو ئەستێرەیەك وایە هەموو شتێك سنوورو بنەماو توندوتۆڵیی هەیە، هەر نیزامێك سنووری بەزاندو هەتکی بنەماکانی کرد چارەنووسی داڕمانو تێکشکانە ئەمە

ڕەوشتی خوای گەورەیە لە بوونەوەردا بە ئادەمیزادو گیانلەبەرو بێ گیانیەوە ئەمانە هەموو پەندو ئەزموونن لە حاڵی بوونەوەرو نهێنییەکانیو هەروەکو بە هەمان شێوە بووە لە سەردەمی نەتەوە پێشووەکانیش.

ئیبن بەتوتە وتی: بەڵام سەبارەت بە کۆمەڵگای دوورگەی بیناسازان کە حەز ئەکەیت بزانیت ئەی بەیدەبا تەنیا وریاییو هۆشیارییان بە قسەو واتاو زانیاری نەبووە، بەڵکو گرنگترین هۆکار بڕییە لە ئیرادەو کردار، چونکە سەرکەوتن لە کردەوەو مومارەسەو شوێنکەوتنی وتەو کارە باشەکانەو تەنیا تێگەیشتن بۆ مانای ڕاستیی ئازادیی بەس نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە تاکو کۆمەڵ مومارەسەی مانای ڕاستەقینەی ئازادییەکەیان بکەنو ڕەفتارو هەڵسوکەوتیان بەو شێوەیە ڕابگرن کە لە بیرو ناخیاندایە.

بەیدەبا وتی: ئەی ئەوە چۆن ڕووئەدات ئەی گەڕۆکی دانا؟

ئیبن بەتوتە وتی: لێرەدا ڕۆڵی پەروەردەو ویژدان دێت، چونکە ڕەفتارو ناخی مرۆڤ ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاهێنانەی کە لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوون دەستپێدەکات ئەگەر نەکەوێتە پێش ئەوەش، چونکە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەوەی ئەیکاتو ئەوەی وازی لێ ئەهێنێتو ئەوەی حەزی لێ ئەکاتو ئەوەی پێی ناخۆشە لە بنەڕەتدا ئەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەکردنی بە بچووکی بەو شێوەی کە دایکو باوکی ڕایان هێناوە هەتا ئەو ڕەفتارە وای لێ دێت ئەبێتە سیفەتو خاسیەتێك لای ئەو کەسەو لێی جیانابێتەوە، ئەگەر لە ساتێکی غەفڵەتو بێ ئاگایی لایدا ئەوا ناخو ویژدانی بە ئاگای ئەهێننەوەو هانی ئەدەن بەرەو ئەوەی کە لەسەری جێگیر بووەو ڕاهاتووە لە کاتی منداڵیدا، لە کۆنیشدا وتوویانە:

"ئەو شتەی بە گەنجی لەسەری ڕاهاتووە هەر بەوەش سەرسپی دەکا"

شاعیریش ڕاستی کردووە کە وتوویەتی:

و ینشأ ناشئ الفتیان فینا

علی ما کان عوَّده أبوه

کەواتە پەروەردەو خێزانو ڕووناکبیری پەروەردەیی دایکو باوك ڕازێکی ڕاستەقینەیە لە سەرکەوتنی کۆمەڵگاکانو لە جێگیرکردنی پایەو بنەماکانی ئەگەر خێزان سەلامەتو پەروەردەی باش بوو، ئەوا تاکو کۆمەڵ بەرزئەبنەوە بەرەو جوانییو خۆشییو کامەرانیی، بەڵام پێچەوانەکەی ئەگەر خێزان ڕووخاو پەروەردە نەما کۆمەڵگا دائەبەزێتە خوارەوە بە

پەیژەی تاریکستانیی و چڵپاو و فەوتان و کۆتاییەکەی پارچە پارچەبوون و نەمانە، ئیتر درێژخایەن بێت، یان کەم.

ئیبن بەتوتە (رووی کردە بەیدەبا): بەڵێ ئەی بەیدەبا ژیان بەبێ ئازادیی هیچ مانایەکی نییە و ئازادیش بوونی نییە بەبێ پەروەردەو راهێنان و تۆکمەیی و هەستی لێپرسینەوە و بەرژەوەندیی گشتیی.

بەیدەبا وتی: فێری وانەی ئازادیت کردم ئەی پایەبەرزی دانا کە لە بەنرخترین ئەو دەرسانە بوون لە ژیانمدا، چونکە هێشتا لەبەر چاوم لێڵ بوو، هێشتا زۆری خەڵکی و وڵاتان بە نیەت باشیش دیلی ئەو ئازادییەن کە خستوونیەتەو ئەیانخاتە ناو بەرەڵڵایی و بێ سەروبەریی کۆمەڵایەتیی و بڵاوبوونەوەی شتە سووك و بێ بایەخەکان و هەڵوەشاندنەوەی کەسایەتیی و خێزان و هەڵگەڕانەوەیان لە چڵەپۆپەی بەختەوەریی بەرەو نزمترین پلەی گەوجیی و نەفامیی بە هۆی ئەم تێکەڵ و پێکەڵ کردنەی واتاکانی ژیان، چونکە لە سوننەتی بوونەوەر لایانداوەو پەندو عیبرەتیان لە نەتەوەو شارستانییە پێشووەکان وەرنەگرتووە لە کاتێکدا ئاوەدانیی و شارستانییان بە جارێك تێك رما، چونکە نابینا بوون بە هۆی رابواردن و ژینی ئاژەڵانە و گومڕاهییان، ئەو ئوممەتانەی تووشی ئەم داڕووخانە بوون لە ناوەڕۆکدا بە هۆی رەوینەوەی نەریت و خووڕەوشت و لێکدابڕانی کەسایەتی لەو کۆمەڵگایانەدا لە دوای ئەوەی لە لوتکەی هێزو دەسەڵات و دەرکەوتندا بوون، ئەمەش پەیڕەویی خوای گەورەیە بەرامبەر بە دروستکراوەکانی ئەگەرچی لە تاو نەفامیی و گومڕایی خۆیان وایانزانیوە باشیان کردووە.

لەو کاتەدا شێخی گەڕۆك لە پەنجەرەکەوە سەیری رۆشتنی باڵندەکانی دەکرد لە حاجی لەقلەق و مراوی و کۆترو گاکۆتر کە باڵیان رائەوەشاند لە ناوەندی ئاسۆیەکی پەمەیی روون، بە ئاوازی خۆش و جریوە سەرقاڵ بوون بە نێوان هەوایەکی بەریندا، بەرەو هەر لایەك بیانویستایە بە زەوق و شەوق و ئازادییەوە دەڕۆشتن.

مامۆستا رووی کردە بەیدەباو وتی: سەیری ئەو ئاسمانە بەرینە رووناکە بکە لە پەنجەرەکەوە چاووت تێر بکە لەو رەنگە جوانە بریقەدارەی سەیری ئەو پۆلە باڵندانە بکە بە شێوەو رەنگ و ئاوازی خۆش و جوانیان، هەروەها چاوەکانت پڕ بکە لە کاتێکدا بە شەوق و ئازادیی و بەردەوامیی ئەڕۆن بەرەو شوێنی مەبەستی خۆیان، چۆن لە زۆر شتدا چونیەکن

لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییان هەیە! لەوێدا نیشانەی جوانی لە جۆرو جیاوازییاندا دەبینیت لەگەڵ تەواوکاریی یەکتری لە هاوگەشتێکی یەك مەبەستو یەك ئامانج.

بەڵێ بەیدەبای خۆشەویست، شایانی ئەوەیە هەموو گەلو نەتەوەو دروستکراوەکانی بە پێی جیاوازیی رەنگو زمانو جۆری ورزەو چالاکییان ئامانجە بەرزەکانیان پێکەوە گرێ بدەن بۆ دەوڵەمەندکردنی ژیانو ئاوەدانی بە تەواوکەری یەكو هەوڵو ماندوو نەبوون، بە هەموو حەزو قەناعەتو ئازادییەك لە پێناوی هەقو دادپەروەریی و گیانی یارمەتیی و ئاشتیی و ئاسایش، بێگومان ئەمەش گرانترین دەستکەوتەو بە نرخترین دیارییە، بەرزترین ئامانجە کە خەڵکی بە دەسی ئەهێنن لە گەشییەکانی بوونێ ژیاندا.

بەیدەبا وتی: بەڵێ مامۆستای گەورە، بە بێ ئەقڵێکی گەورەو ئازادییەکی راستەقینە مانای ژیان نییەو بوونی نییە کە شیاوی رەنجو تەقەلاو ماندووبوون بێت.

شێخ ئیبن بەتوتەوتی: ئەی بەیدەبا لەگەڵمدا بڵێ ناخوێنێت مەگەر بولبولێکی ئازاد لە ئاسمانو نانەڕێنێ مەگەر شێرێکی ئازادیی رەها لە دارستاندا.

بەیدەبا وتی: بەڵێ بە هیوام ئەوەی ئیبن بەتوتەی داناو پەندیار پێی وتین لە بارەی وانەکانی ئازادیی فێرببینو هەماهەنگی لەگەڵ ژیریو چاکەخوازیدا.

بەڵێ نەتەوەیەك نامێنێتەوەو شکۆیی بەردەوام نابێتو هاوبەش نابێت لە موسەخەرکردنی گەردوونو دروسکردنی شارستانیی مرۆڤایەتیی مادەم نەتەوەیەکی هۆشیارو چاکەخوازو ئازاد نەبێتو نەگاتە ماناو مەبەستی راستەقینەی ئازادیەکەی کە چۆن بە کاری بهێنێتو چۆن پەروەردەی رۆڵەکانی بکاتو رایان بهێنێت لەسەر مومارەسەکردنی ئازادیی بە شێوەیەکی راستەقینە کە بەشو رەنگدانەوەیەکی بنەڕەتی بێت لە بنەماو رۆشنبیریی و ئاوەدانییەکەی.

# شکۆیی‌و رزگاریی له خۆشه‌ویستیی خوادایه

هه‌موو جارێکی تر کۆبوونه‌وه‌و یه‌کیانگرت بۆ بینینی مامۆستا، مامۆستا (ئیبن به‌توته) پرسیاری کردو وتی: ئه‌ی ئه‌و شته‌ی تر چییه ئه‌ی به‌یده‌با که خه‌یاڵت پێوه‌ی خه‌ریکه‌و تا ئێستا پێم نه‌وتوویت له باره‌ی خه‌ڵکی دۆڵو دوورگه‌وه‌؟

به‌یده‌با وتی: ئه‌و خاڵه‌ی تر مامۆستای دانا، په‌یوه‌ندیی هه‌یه به‌وه‌ی جارێکیان وه‌سفی خه‌ڵکی دوورگه‌تان کرد که ئه‌وان به‌هره‌مه‌ندن به ئازایه‌تییه‌کی شاراوه‌ی ئه‌ده‌بیی‌و هه‌ستکردن به شکۆیی‌و رێزو سه‌ربه‌رزیی دوور له خۆ به زل زانیی‌و درۆو خۆهه‌ڵکێشان.

(ئیبن به‌توته) وتی: به‌ڵێ ئه‌ی به‌یده‌بائه‌وه‌م بۆ باس کردیت هه‌ر له یه‌که‌م دیداریاندا چاوت به هه‌ڵه‌دا ناچێت ئه‌گه‌ر بیانبینیت.

به‌یده‌با وتی: به‌ڵام مامۆستا گیان سه‌رچاوه‌ی ئه‌م ئازایه‌تیی‌و رێزو شکۆمه‌ندییه‌ت بۆ روون نه‌کردمه‌وه که به‌خته‌وه‌رن پێی، هۆی سه‌رسوڕمانیشم له‌مه‌دایه زۆربه‌ی خه‌ڵکی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی ئێمه ئه‌م سیفه‌تانه‌یان لێ بزر بووه له کاتێکدا زۆر قسه‌ی له باره‌وه ئه‌که‌نو حه‌زی پێ ئه‌که‌نو ئاره‌زوومه‌ندن خۆیانی پێ جوان بکه‌ن، ترس‌و درۆو دووڕوویی‌و هه‌ستی زه‌لیلیی‌و ملکه‌چیی بۆ که‌سی خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات‌و ماڵیا هێزو پله‌و پایه سیفه‌تانێکن وای لێهاتووه زۆربه‌ی خه‌ڵکی‌و گه‌لان پێوه‌ی ئه‌نالێنن.

به‌ڵکو مامۆستا شتێکت له‌لا بێت که ئه‌م باره ئاڵۆزه رۆشن بکاته‌وه که سه‌رم سوڕماوه لێی، چونکه به‌شێکی گه‌وره‌ی گه‌لان تیاداماووونو تووشی دواکه‌وتوویی‌و ده‌سته پاچه‌یی‌و لاوازیی بوون، ره‌گه‌زی خراپه‌کاریی‌و سته‌مکاریی ده‌ستی به‌سه‌ردا گرتوون که نزمترین تا به‌رزترینیان بووه به بارمته‌ی ده‌سی دوژمن‌و نێچیرێکی ئاسانو ده‌سته‌مۆی نه‌ته‌وه درنده‌کانی تر.

شێخ ئیبن به‌توته وتی: راست ده‌که‌یت ئه‌ی فه‌یله‌سفی دانا، بێگومان مه‌سه‌له‌یه‌کی تری ئاڵۆزو گرنگه‌، من سوپاس بۆ خوا له ناو هه‌گبه‌که‌مدا ده‌ستکه‌وتێکی باش ئه‌بینم، به‌ڵکو وه‌ڵامی پرسیاره‌کانی تۆی تێدابێت‌و هه‌ندێك له سه‌رسوڕمانت لا بدات، نهێنی ئه‌وه‌ش ئه‌ی به‌یده‌با له‌وه‌دایه هه‌ستکردن به رێزو به‌رزێتی لای هه‌ندێ گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌و هه‌ستی سووکایه‌تیی‌و خۆ به که‌م زانینو زه‌بونی لای هه‌ندێکی تر که له بنچینه‌دا ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ تێڕوانینێکی گشتیی بوونه‌وه‌رانه لای هه‌ندێك‌و هه‌ندێکی تر.

میللەتو نەتەوەی سەربەستو پێشکەوتوو ئەو میللەتانەن کە ئازادییو رێزو بەها بەرزەکان کە ناخو سروشتی مرۆڤ مەیلی بە لایدایە بناغەی تێڕوانینو بیرو بۆچوونە گشتییەکەیەتی.

بەڵام ئەو نەتەوانەی بیروبۆچوونە گشتییەکەیو بەرنامە فیکرییەکەی بشێوێنێتو تێکەڵی بکاتو ئەوەی ئازادیی خۆییو هەڵسوکەوتیو هەڵبژاردنەکانی لە هەر ئاسێکدا لە دەستی خۆیدا نەبێت، ئەوا هەستی رێزو گەورەیی ون کردووەو هەرچەندە قسەی رازاوەو بەڵگەی ساختەدروس بکات هیچ بە دەست ناهێنێت، مەگەر زەلیلییو سووکایەتیی نەبێت لە گشت پەیوەندییەکانیدا، لە ئاکامیشدا بە گەندەڵییو خراپەکاریی کۆتایی دێت.

ئەی بەیدەبا، خاوەن بەرژەوەندییە تایبەتەکان گێرەشێوێنو دکتاتۆرەکان کەمو کوڕییان نەبووە لە شێواندنی هزرو بیرو بۆچوونو ساختەکارییو گومڕاکردنی خەڵکی نەزان، لەگەڵ دوورخستنەوەی کەسانی دڵسۆز بۆ ئەوەی بە تەواوی مافی ئازادیی لە رۆڵەکانی میللەت بکێشنەوەو واداریان بکەن لەسەر پەسەندکردنی سەروەرییو راسپاردەیی لەسەریان بە ناوو بەهانەی جۆراو جۆرەوە کە ناژمێررێت هەتا بتوانن بە تەواوی جێی خۆیان قایم بکەنو بیانکەنە قوربانی کێشەکانیانو بۆ خزمەتی چاوچنۆکییو بەرژەوەندییە گەندەڵییەکانیان.

بەشێکی گەورەی گەلان ئەمڕۆ کە چەوساوەنو ئەوەی کە ئەکەوێتە ناو جەرگەی زەمین لە پێشدا میللەتانێکی بەرزو سەربەست بوون، وەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە لە کاتێکدا بەهرەمەندبوون بە تێڕوانینێکی دروستو بەرنامەیەکی رستەقینەی گونجاو بە پێی سەردەمە جۆراوجۆرەکانی پێشوو، هەر یەکەو بە جۆرێ بەختەوەر بوون بە هەستی رێزو گەورەیی دەسەڵاتو بەرەوپێش چوونو داهێنان، هەروەها هەستی بەرپرسێتیو بەرژەوەندیی گشتیی بەرامبەر خۆییو دەوروبەرەکانی. هەمان ئەو سیفەتانەی کە خەڵکی دۆڵو دوورگەی پێ کامەران بووە، ئەوەی دروسیان کردووەو بە دییان هێناوە بە هێزو بازووی رۆڵەکانیو هۆشو ژیریی زاناکانی لە شارستانییو ئاوەدانیی.

بزانە ئەی بەیدەبا خاوەن دەروونە تەواوەکان بە سروشتی خۆیان ئارەزوومەندی هەقو دادپەروەرییو میهرەبانییو ئەمنو ئاساییشن، لەبەر ئەوە بە خواستو ویستی ئازادانەیانو ئەقڵی پێگەیشتوویان دامو دەزگاو رێکخراوەکانیان ملکەچ دەبن بۆ راستییو دادپەروەرییو

سۆزو ئەمنو ئاسایش لە هەمان کاتیشدا دژی درۆو ساختەو ستەمو دڵ رەقیو دەستدرێژییو گەندەڵێن لەبەر ئەوە بۆشاییەك ناهێڵنەوە کە ژیانیان خراپ بکەن.

رقو کینەی خوا لە ستەمو دڵو رەقیو شەڕەنگێزییو گەندەڵییو سیفەتی خراپەکارییو دڕندەیی، لەو کەسانەی بە ئشکراو بە نهێنی سوورن لەسەری وەك ئەو کینەیە نییە لە بەرامبەری ئەو کەسانەی کە حەز بە خێرو چاکە دەکەن، ئەگەر کەوتنە ناو تاوان داخی بۆ ئەخۆنو پەشیمانی لەسەردەرئەبڕنو بەردەوام نین لەسەر کردەوەی ناشیرین.

خەڵكو میللەتە ڕێ راستەکان ئەی بەیدەبا میللەتانێکن بە سروشتی خۆیان خوایان (الله)خۆش دەوێتو رقیان لە شەیتانە، چونکە راستییو دادپەروەرییو سۆزو میهرەبانییو ئاشیی لای خوای گەورەوەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە هەموو سیفەتو کردەوەیەکی ناشیرین لە خراپەو شەیتانەوەیە، لە دەروونێکەوەیە ئەمر بە خراپەئەکات، بەڵام با بزانین خلیسکانوکەوتنە ناو گوناهو تاوان ئەوا خوای بەخشندەو میهرەبان لێبوردەیەو تۆ بەو پەشیمانییو قبووڵ ئەکات، خراپەکان ئەشواتەوەو چاکەکانی زیاد ئەکات.

ئەی بەیدەبائەگەر ئێمە تێگەیشتین خوا (الله) کێیە؟ چ رۆڵێك دەبینێت؟ تێگەیشتین شەیتان کێیەو چی دەکات؟ بۆمان دەردەکەوێت کە بەشێکی زۆری ئادەمیزاد بە شێوەیەکی راستەقینە خوای خۆش دەوێتو رقیان لە سەیتانە، هەرچەندە مانای ئەوەش نازانن؟، چونکە بیرو بینشی زۆربەیان ێکەڵو پێکەڵو شێواوە، (خوا) لای ئەوان هێزێکی زۆردارە لێدەرە، لە ناو بەرەو چاودێریی هەنگاوەکانیانو هەڵەو تاوانیان دەکات، ئاگاداریی بەڵاو ناڕەحەتییەکانیانە، ئەمەش بە هۆی دواکەوتوویی بیرو هزری ئەم نەتەوانەو بە هۆی ئارەزوبازیی دکتاتۆرو خاوەن دەسەڵاتەکان لەنێو خۆیانداو خاوەن بەرژەوەندییە تایبەتییەکان لە دەوروبەریان هەتا گەلەکانیان بترسێننو زەلیلیان بکەنو بتوانن رێزو بەرزێتی تیایاندا بکوژێننەوەو دەستدرێژی بکەنە سەر مافو تواناکانیان، ئەمەش رووندادات مەگەر بە چەواشەکردنی بیرو بۆچوونی ئەم میللەتانە نەبێو تێکەڵکردنی حوکمو بڕیار، چونکە حوکمی هەڕەشەو ترساندن ئاڕاستەی سەرپێچیکەرانو خاوەن دەروونە دڕندەکان کە تەنیا ئارەزوویان لە شەڕو ستەمو خراپەکارییو دڵڕەقییو شوێنکەوتنی شەیتانە کەواتە ئەو حوکمە ئاڕاستەی دڵی ئیماندار ناکرێت کە ئارەزووی لە خووڕەوشتی گەورە دادپەروەرییو میهرەبانییو ئاشتییە کە لە سیفەتەکانی خوای بەخشندەوە هەڵقوڵاوە هەتا تووشی دەردی

ترس‌و تۆقاندن ببێت‌و نائومێد بێت‌و بڕوخێت له کاتێکدا هیچ له خۆیدا نابینێت مه‌گه‌ر هه‌ڵه‌و تاوانی بچووك نه‌بێت.

گرنگ ئه‌وه‌یه بزانیت ئه‌ی به‌یده‌با ئه‌وه‌ی به ترس‌و زۆره‌ملێی بسه‌پێنرێ دوور ئه‌که‌وێته‌وه‌و به دوادا ئه‌چیت، ئه‌وه‌ی به خواست‌و ئاره‌زوو بێت نزیك ئه‌بیته‌وه‌و په‌سه‌ندی ئه‌که‌ی، هیچ نه‌ته‌وه‌یه‌ك ناتوانێت به هێزو زرنگ بێ‌و به‌رهه‌م بهێنێت‌و ئه‌نجام بدات مه‌گه‌ر بیروبۆچوونی‌و بناغه‌ی قه‌واره‌ی کۆمه‌ڵگاکه‌ی له‌سه‌ر خۆشه‌ویستیی‌و ره‌غبه‌ت دامه‌زراندبێت، هه‌ر ئومه‌تێك ناخی هاووڵاتیانی به ترس‌و تۆقاندن پڕ بکاته‌وه چاره‌نووسه‌که‌ی هه‌ر ده‌سته‌پاچه‌یی‌و زه‌بوونیی‌و بێ ده‌سه‌ڵاتییه له‌به‌ر ئه‌وه پێویسته ئه‌ی به‌یده‌با پارێزگاریی له میلله‌ت‌و یاساو دام‌و ده‌زگاو رێکخراوه‌کانی، هه‌روه‌ها پاراستنی ماف‌و به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی له گرنگترین مه‌به‌سته‌کانی ژیانی مرۆڤ‌و کۆمه‌ڵگای مرۆڤایه‌تیی بێت که به‌بێ ئه‌وانه نه ئایین‌و نه هاووڵاتیی نه ماف‌و نامووس ناپارێزرێ.

ئه‌و نه‌ته‌وانه‌ی که تێڕوانینه گه‌ردوونییه‌که‌یان چه‌واشه‌و له‌که‌دار کراوه‌و له چوارچێوه‌ی گشتیی‌و شارستانیی دوورخراوه‌ته‌وه‌و ته‌نیا بایه‌خی به لایه‌نه تاکییه‌کان ئه‌دات هه‌تا وای لێهاتووه مرۆڤ له‌م کۆمه‌ڵگایانه‌دا ئامانجی ته‌نیا مانه‌وه‌ی تاکه که‌سی بێت‌و به که‌مترین هه‌وڵ‌و تیکه نانێك په‌یدا بکات هه‌تا مردن.

ئه‌ی به‌یده‌با ئه‌م میلله‌تانه گۆڕاوون بۆ تاکه که‌سانێك که کێشه‌و پێش بڕکێیانه به دوای ژیانێکی که‌م‌و بێ بایه‌خ، دکتاتۆرو داگیرکه‌رو ده‌ڵاڵه‌کان فه‌رمانڕه‌واییان ئه‌که‌ن، چونکه زه‌بوونیی‌و بێ ده‌سه‌ڵاتیی سه‌قامگیر بووه تیایاندا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وانه که‌سانێکی خۆپه‌رست‌و چاوچنۆکن‌و رووت‌و ته‌نیا بوونه‌ته‌وه له هێزی کۆمه‌ڵ‌و نه‌ته‌وه، وزه‌و توانای زانست‌و شارستانییان لێ بزر بووه.

به‌ڵێ به‌یده‌با بوونی تاك نییه به‌بێ بوونی نه‌ته‌وه‌و نه‌ته‌وه‌ش پێکنایه‌ت به‌بێ دروستکردنی تاك به تێرو ته‌واویی، تاك به‌رپرسیاره له پاراستنی نه‌ته‌وه‌و نه‌ته‌وه‌ش به‌رپرسیاره له پاراستنی تاك‌و دابینکردنی پێداویستییه‌کانی.

گه‌ل‌و نه‌ته‌وه پێشووه به‌رزو به‌ڕێزه‌کان ـ وه‌کو ده‌زانیت ـ رێزو سه‌ربه‌رزیی‌و ئازایه‌تییان له‌و په‌یوه‌ندییه راسته‌قینه وه‌رگرتووه به خوای گه‌وره‌وه، واته خۆشه‌ویستیی بۆ خواو راستیی‌و دادپه‌روه‌ریی‌و سۆزو ئاشتی، هه‌ر به‌وه‌ش‌و به خواست‌و ویستی ئازادانه‌ی خۆی

ئەبێتە بەندەی هەموو بنەماو ڕەوشتە بەرزەکان، واتە بە فێرەتو بەو بیروبۆچوونەی کە لەسەر خۆشەویستیی دامەزراوە دەروونێکی بەرزو دامەزراوەو دروست دەبێت نەك بە کێگیراو، یا بەندە کراو کە خۆی ئازاد کردووە لە بەندایەتیی شەیتانو هەر دەسەڵاتێکی خراپو شتی ناڕەوا، لە ناخو ناوەڕۆکیدا جگە لە خۆشویستنی هەقو دادپەروەریی‌و سۆزو میهرەبانی‌و ئاشتیی نییە، واتە وشەویستی خوای گەورە کە ئازادیی تەواوی تیا بەدی دێت.

هەروەها خۆشەویستیی خواو سیفەتە جوانەکانی سەرچاوەی هەستو واتاکانی خۆشویستنو خواستو ئاواتەکانە، کە هیچ هەستێکی زەلیلی‌و خۆ بە کەم زانین، یان زۆرەملێ دروست ناکات لە مرۆڤدا، بەڵکو ئەو هەستی ترسو بیمە لە خوای گەورە بریتییە لە هەستی ترسی کەسێك لە ناڕەزایی‌و تووڕەیی خۆشەویستەکەی بەرامبەری، ئەمەش بریتییە لە ترسی بەندە دامەزراوەکانی خوا نەك ترسی بەندەی بە بەندکراوان.

پەرستنی کۆمەڵێك هەستی بەجێیە کە تەعبیر ئەکات لە ماناکانی خۆشەویستیی‌و ڕازیبوونو بریتییە لە هەسێك کە دڵەکان پڕ ئەکات لە هێزو گەورەیی‌و سەربەستییەکی تەواو لە هەر دەسەڵاتێکی زۆردارو لە هەر شعورێکی سووکایەتیی‌و خۆ بە کەم زانین، هەستێکە پڕێتی لە خۆشەویستیی خوای گەورەو هەموو ماناکانی ڕاستی‌و دادپەروەریی‌و ڕێزو شکۆیی، بە داخەوە ئەی بەیدەبا هەندێك لەو گەلو نەتەوانە لەم سەردەمەدا توانراوە گومڕا بکرێن بە زۆر لە نیەت باشەکانی خۆی لەوانە: بە شێوەیەك وا گومان ئەبات ئازادە، لە کاتێکدا مافی هەڵبژاردنی خۆی واز لێ ئەهێنێتو چارەنووسی خۆی ئەدات بە دەست چەند مۆڵەت پێدراوێکی وشكو بێبایەخو ژمارەیەك لە کاربەدەستو ڕاسپێرراوی چەواشەکار بۆ ئەوەی ژێرییان پووچەڵ بکاتەوەو لە ناخیاندا هەستی بچوکیی‌و بەندایەتی‌و زەلیلیی‌و بێ دەسەڵاتیی‌و ترسو تۆقین جێگیر بکات، بەمەش توانیان هاوپەیمانێتی خۆیانو دەسەڵاتەکانیانو بەرژەوەندییە تایبەتییەکان لە ناو کۆمەڵگادا پتەو بکەن، هەروەها هێزو دەسەڵاتی چاوچنۆكو داگیرکەران لە داموو دەزگاکاندا پایەگیر بکەن.

دیسان گەلانێکی تر هەیە وا ئەزانێ ئازادە لە کاتێکدا مانای ئەو ئازادییەی خۆی نازانێتو مانای ژیانو مەبەست لە بوونیدا، ملکەچی هەواو هەوەسو ئارەزووە ئاژەڵییەکانێتی بەبێ بەرگیریی‌و سنووردانانێكو ڕێکخەرێکی بنەماو ڕەوشت، یان بەبێ لێپرسینەوە، ئەمە نموونەی ئەو گەلو نەتەوە ماددیانەیە لە جیهانی ئەمڕۆدا کە لە بێ

ئاگاییو سەرگەردانییەکی تەواودا ئەژین، هیچ رووبەکی ژیانو ئامانج لە بوونیدا نازانێت جگە لەوەی کە پێوەی خەریکەو راهاتووە لەسەری، کەواتەئەی بەیدەبا ئەمانە تێڕوانینێکی گشتیانەیان نییەو بە راستی مانای ئازادییو مەبەستەکانیان نەزانیوەو بوونەتە کۆیلەی هێزی خراپەو هەواو ئارەزووە داڕووخاوەکانیان، بەوانەش خووڕەوشتو نەریت لە بوونیاندا بەرەو نەمان ئەچێت، جگە لە یاچوونو رەنجەڕۆیی هیچیان بۆ نامێنێتەوە. هەرچەندەش وابزانن بە زاڵ بوونە ماددییەکەیان باشیان کردووە، چونکە نەتەوە پێشووەکان هەمان رێڕەویان گرتە بەر لە کاتێکدا رێگای خۆیان رونکردو گومڕابوون، هەرچەندە بۆ ماوەیەك هێزو دەسەڵاتی ماددیان بەدی هێنا، بەڵام هەر لە بنەڕەتەوە رووخان، چونکە بەندو باوی رەوشتییو کۆمەڵایەتییان لێك هەڵوەشاو دەسەڵاتو دەوڵەتیان نەماو شارستانییو ئاوەدانییان بە جارێك رووخا.

ئەی بەیدەبای فەیلەسووف، ئەوەی ك بۆم باسکردیت ئەوە تێگەیشتنو مانای راستەقینەیە بۆ ئازادیی، پێم وابێتو ئەوەی کە فێربووم لە ژیانداو ئەزموونو شارەزاییم وەرگرتبێت لە ژیانو رێڕەوی سەردەمو نەتەوە پێشووەکان، هەروەکو مانای راستەقینەی بیرو بۆچوونی گشتییانەی سەرکەوتوو لای گەلانی دوورگەی بیناسازان لە گرنگترین سەرچاوەی هێزو چالاکییو راپەڕاندنیانە، هەروەها سەرچاوەی ئەو هەستە گەورانەیە لای ئەوان وەك هەستی بەرزێتییو رێزو ئازایەتییو بوێریی لە ناخیانداو گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە وزەی نوێسازییو ئاوەدانیی لای ئەوان تەقاندەوە.

گیانی یارمەتییو هاودەمییو هاوکاریی کە بەجێی خۆی گرتووە لە نێوانیاندا پاڵنەرو بزوێنەری ئەگەڕێتەوە بۆ پەرستنو هەستی خۆشەویسیی بۆ خوا " هەق، دادپەروەریی، بەزەیی، ئاشتیی"، دوورەپەرێزییو هەستی رقو کینەی تەواو لە خراپەو زوڵمو زۆرداریو زیانو گەندەڵیی، هەروەها کە سەرچاوەی تەواوکارییو پێکەوە گونجانە لەگەڵ هەموو دەروبەریان لە بوونەوەردا لای ئەوانو لای هەر گەلو نەتەوەیەکیش کە لە شێوەی ئەواندا بووە لە پێشوودا.

ئەی بەیدەبای فەیلەسووف، ئەمە ئەو پەندو دەرسە بوو کە میللەتو نەتەوەکانی ئەمڕۆ پێویستییو ئاتاجیان پێی هەیە بۆ ئەوەی بیروبۆچوونە گەردوونییە راستودروستەکەی بگەڕێنێتەوەو مانای ئازادیی راستەقینەو مانای کارو کردەوەی چاکەو بە کەڵك هەتا

مەبەست لە بوونو ژیانی بزانێت بۆ بەرەو ئاوەدانکاریی‌و شارستایی دروس‌و ئاشتیی لە پەیوەندییەکانیداو جێگرتنەوەی ئاشتیی‌و دادپەروەریی‌و تەبایی لە نێوان گەلەکانیداو بۆ رزگاربوون لە خراپەکاریی‌و زۆرداریی‌و دەستدرێژیی لە کۆمەڵگاکانیداو دروستکردنی شارستانییەکی بەرزو چاکخواز. بەبێ ئەوە ـ ئەی بەیدەبای دانا ـ گەل‌و نەتەوەکان لە کینەو شەڕو کێشەکاندا ئەمێننەوە لە نێوان پەلامارد‌ەرو قوربانیدا، لە نێوان هێزی زۆردار، یان لاوازێکی رووخاوی کەوتوو و لە نێوان دەوڵەمەندێکی زیادەڕۆ، یان هەژارێکی بێ دەرەتان‌و داماو. هەمووشیان لە راستیدا قوربانیی دەستی ئەوەن کە ئەیانکاتە بەندەو نۆکەری دەسەڵاتی خراپەکاریی‌و داگیرکاریی‌و توندوتیژیی‌و گەندەڵییە ئاژەڵییەکان.

شێخ ئیبن بەتوتە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، رووی کردە بەیدەباو وتی: بەڵام تۆ ئەی بەیدەبا کە پرسیارت دەربارەی ئازادیی کرد، لەوێدا سیفەتێکی گرنگی تر هەیە کە پەیوەندیی بە ئازادییەوەیەو بەکارهێنانی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە لە کۆمەڵگادا لە گرنگترین ئەو خاڵانە دائەنرێت کە خەڵکی دوورگەی پێ جیادەکاتەوە، بۆ هەر نەتەوەیەکیش ناکرێت سەر بکەوێ‌و پێش بکەوێت مادەم بەهرەمەند نەبێت بەو سیفەتە.

بەیدەبا وتی: مامۆستای پایەدار ئەو سیفەتە چییە؟ من تامەزرۆم بۆ زانینی.

مامۆستا وتی: ئەو سیفەتە بریتییە لە (هەستکردن بە بەرپرسیارێتی)و پێداگرتن لەسەر (بەرژەوەندیی گشتیی)، چونکە ئەگەر هەستی لێپرسینەوە لە تەواوی ویژدانی هەموو هاوولاتییەکدا نەبێت‌و نەزانێت کە بەرژەوەندیی تاکە کەسێك لە بەرژەوەندی کۆمەڵدایەو بەرژەوەندیی کۆمەڵیش لە راستیداله بەرژەوەندیی تاکدایە، کەواتە هیچ بۆشاییەك لە بواری کۆمەڵایەتیی ناهێڵێتەوە بۆ پێکەوە بەستنی بە کۆمەڵگاو پاڵ پێوەنانی‌و لێپرسینەوەی، کەواتە بوونی تاکە کەسێك نییە بەبێ گرنگیی‌و بایەخ بە خێزان‌و خێزانیش بوونی نییەو چاودێری ناکرێت بەبێ کۆمەڵگاو نەتەوە، نەتەوەش پێکنایەت بەبێ کۆمەڵگاو ئاوەدانیی‌و دام‌و دەزگاو شارستانیی‌و رۆشنبیریی، ئەمانەش هەموو دروست نابن بەبێ بوونی تاکێکی ئازادو سەربەست‌و بە توانا، کەواتە تاك‌و نەتەوە لە دروستکردنی گەلانێکی سەرکەوتوو لەگەڵ بوونی رۆشنبیریی‌و پەروەردەی دروستیی‌و رێکخراوو دامەزراوەکانی‌و کارو بەرهەمیان ئەوانە جمکێکن کە لە یەك جیانابنەوەو بریتیین لە ئەندامانی یەك لەش کە یەکتر بەهێ ئەکەن، تاك تیایدا بەرپرسیارە لە پاراستنی نەتەوەو نەتەوەش بەرپرسیارە لە پارێزگاریی تاك‌و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی.

ئەی بەیدەبا پێویستە سووربین لەسەر پەروەردەی رۆڵەکانمان هەتا بتوانن بە جوانیی رۆڵی خۆیان ببینن لە پێکهێنانی خێزانەکانیاندا کە بناغەی دروستکردنی کۆمەڵگایەو دایەنگای پێگەیاندنی هاووڵاتیانە، خاکی گەشەکردنو دروستکردنی تواناو چالاکییانە لەسەر جەوهەرو سروشتی دایکایەتییو باوکایەتی تیایاندا ئەویش بریتییە لە خۆشەویستییو قوربانیدان لەلایەن دایكو هەستی بەرپرسیارێتیو نان پەیداکردن لە لایەن باوکەوە ئەگەر ئەم خاسیەتە لە سروشتی دایكو باوك نەما، یان رۆڵیان گۆڕییەوەو چەواشەکران، ئەوا خێزان ئەرووخێتو باوانو رۆڵەکانیان پێکەوە نەگبەتو سەرگەردان ئەبن، هەروەها پەیوەندییەکانی خۆشەویستییو کەسایەتییو هەستی برایەتیی لە ناو کۆمەڵگادا تیادەچێت، ئەمەش هەر ماوەیەکی بەسە بۆ فراوان بوونی درزەکانی بناغەی کۆمەڵگا هەتا کۆتایی دێت بە داڕووخانو نەمان.

ئەی بەیدەبا مرۆڤە ناکامەکان ئەوانەن کە لە ژیانیاندا تەنیا خۆیان دەبینن و ئەوەشی کە بە دوایدا رائەکەن بۆ ئەوەی خۆیانی پێ دەوڵەمەند بکەن، لە راستیدا ئەوانە کەڕو لاڵێکی دەستەوسانن کە رۆڵی بارگرانیی ئەبینن لە ژیاندا، ئەوانە نەخۆشن لە نێو نەتەوەو کۆمەڵگاکانیاندا.

بەهای مرۆڤ لە ژیاندا بەوە نییە ئەی بەیدەبا کە تەنیا سکی خۆی تێر بکاتو بە شوێن ئارەزووەکانی خۆیدا بگەڕێت، بەڵکو بەهای لەم ژیانەو ژیانی دواییشدا بە هەوڵی خێرو چاکەو دڵسۆزییکردنە لە کارەکانیو پەیوەندییەکانی وەك خێزانیو ناو کۆمەڵگاو نەتەوەو مرۆڤایەتیدا بە هەوڵو قوربانیدانو بەخشین تاك دێتە بەرهەم، تواناو وزەی دەرئەکەویو شکۆدارو گەورە ئەبیو ژیانی جوان ئەبێتو مانای بوونی خۆیی بەدی دەهێنێ لەگەڵ مەبەستی ژیانی لەم جیهانەو جیهانی رۆحدا ئەی بەیدەبا بە هەڵەدا چووە ئەو کەسەی وا گومان ئەبات کە بە تەنیا هاتۆتە ئەم دونیایە بۆ ئەوەی بە تەنیا بژیو بە تەنیا بمرێت، چونکە هەموو کەسێك کە دێتە ناو ئەم ژیانەوە منداڵی دایكو باوکێکەو ئەندامێکە لە کۆمەڵگاو خشتێکە لەو نەتەوەیەی کە هەڵی گرتووەو ئەیپارێزێت، کەواتە پێویستە لەسەری هەوڵ بدات بۆ سوودمەندییو پارێزگاریی لێکردنی.

ئادەمیزاد بە هیلاکا ئەچێت، میللەتەکان سەرگەردان ئەبن لە کاتێکدا پەیوەندییەکانیان هەڵئەوەشێننەوەو پەیوەندیی رۆڵەکانی بەرەو نەمان ئەچێت، هەروەها واتای گشتێتییو

هەستی بەرپرسی بەرامبەر کۆمەڵو مرۆڤایەتی لە ژیانیدا بزر بکات بە شێوەیەك کە ئەندامانی پێك نەیەن لەسەر برایەتییو هاوکارییو ڕێزی مرۆڤو بە هاووڵاتی بوونو کۆنەبنەوە لەسەر بەرزکردنەوەی ئامانجو ڕێبازو خووڕەوشتە بەرزەکان.

ئەم کۆمەڵگایانە بە ڕاستی مانای بوونی مرۆڤیان تێدا روونە، مانای ژیانو توانای سوودگەیاندنیان نییە بەمەش بەهای کۆمەڵگایانو رەنگدانەوەیان دائبەزێت هەتا خوارتریش لە کۆمەڵگای کەڕولاڵەکانو بە شێوەیەکی راستەقینە حاڵیان خراپتریشە لە کۆمەڵگا ماددییە ئاژەڵییەکان کە پێکدێنو یەك دەگرن لەسەر رەگەزپەرستیی هۆزایەتییو نەتەوایەتیی، هەروەك چەشنی گیانلەبەری دڕندە لە توندوتیژییو پەلاماردان، هەروەها ئەوەی کە لە جۆری ئەمانەیە تایەکە لەو ترازووە.

کەواتە ئەی بەیدەیا پاراستنی ئوممەت ئەرکەو پاراستنی نیزامو یاساو دامو دەزگاکانی لەگەڵ پارێزگاری لە مافو بەرژەوەندییەکانی پێویستە لە گرنگترین مەبەستەکانی ژیانی مرۆڤو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بێت، چونکە بەبێ ئوممەتو دامو دەزگا سەربەخۆو بە تواناو بەرزەکانی ناتوانرێت پارێزگاریی لە ئایین بکرێت، ناتوانرێ هاووڵاتیان بپارێزرێتو چاودێریی لە مافو سامانو ناموسی بکرێت، لەبەر ئەوە تاك بوونی نییە بەبێ ئوممەت، ئوممەتیش دروست نابێت بەبێ تاك، قەوارەیەکن لێك جیا نابنەوەو یەك لە یەکنو (لە یەك بوون).

ئەو نەتەوانەی بینشە گەردوونییە گشتییەکەیان لەکەدار کراوە هەتا سنوورێکی زۆر دوور ئەوە مانای گشتێتییو شارستانێتی لە بیروبۆچوونیدا بزرەو نادیارە، زۆربەی بایەخەکانی بە دەوری لایەنە تاکیەکاندا دەسووڕێتەوە، هەتا وای لێ هاتووە زۆرینەی مرۆڤ لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا هیچ مەبەسێکی تری نییە جگە لە مانەوەی بە تاکە کەسیو گەڕان بە شوێن پارووە نانێکدا بە کەمترین کۆشش هەتا کاتی مردن.

ئەی بەیدەبا ئەو نەتەوانە گۆڕراوون بۆ تاکە کەسانێك کە هەمیشە لە کێشەو زۆرانبازیدا دەژین لەسەر ژیانێکی کەمو بێ بایەخ. داگیرکەرو زۆردارو دەڵاڵەکان فەرمانڕەوایی ئەکەن بە سەریانەوە، چونکە لاوازیی ئەم کۆمەڵگایانە بووەتە هۆی ئەوەی مانای بوونی خەڵکیو ژیانو توانیان تیابچێت، هەموو بەهاو ئاسی کۆمەڵگەیان دابەزێت تا نزمتریش لەکۆمەڵگاو ژیانی بێ هەستو کەڕولاڵەکان، ئیتر ئەوە راستییەکەو جگە لەمەش چەند وتەو باسێکی هەڵخەڵەتێنەرو بەتاڵە، میللەت هیچ بە دوایانەوە ۆ ناکاتەوە جگە لە نەهامەتییو نەدارییو پەرتەوازەییو دواکەوتنو ماڵ وێرانیی نەبێت.

شێخی گەڕۆك بە خەندەوە سەیرێکی بەیدەبای کرد، کە شتێك لە بیرکردنەوەی تێدا بوو، پێی وت: گرنگ ئەوەیە ئەی بەیدەبا تێ بگەیت ئەوەی کە باس‌ولێکۆڵینەوەمان کرد دەربارەی ئازادیی‌و دەربارەی بەرپرسیارێتیی‌و بەرژەوەندیی گشتی، هەروەها لە بارەی پاراستنی ئوممەت‌و ئاشتیی‌و ئاسایش‌و گەشەپێدانی تواناو ئاوەدانکاریی‌و چاکترین هەوڵ بدرێت لەگەڵ گەورەو بچووك، لەگەڵ باوان‌و نەوەکاندا هەتا هەموو تێبگەن‌و کەڵەشێریش تێ بگات!

بەیدەبا بە پرسیارو سەرسوڕمانەوە سەیرێکی مامۆستای کرد لە بارەی ئەو کەڵەشێرەی کە پێویستە مەسەلەکانی ئازادیی‌و بەرپرسیاریی‌و بەرژەوەندیی گشتیی تێ بگات!! پێی وت: مامۆستای پایەبەرز وەکو دەزانیت من شارەزاییەکی گەورەم هەیە دەربارەی ئاژەڵان، بێگومان جەنابت‌و زۆربەی خەڵکی ئاگاداریتان هەیە لە بارەی ئەو چیرۆك‌و سەرگوزەشتانەی کە نووسیومە لەسەر زمانی گیانەوەران، بەڵام هەرگیز باسی ئەو کەڵەشێرەم نەبیستووە کە ئەتوانێت تێ بگات یان پێویستە تیچ بگات! بۆچی بۆمان روون ناکەیتەوە مەبەستان چییە؟

مامۆستا زۆر پێکەنیی لە کاتێکدا ئەیبینی بەیدەبا مەسەلەکەی بە راستی گرتووە، نەك بە شۆخیی‌و گاڵتەبازیی، بە بەیدەبای وت: پێم سەیرە ئەی بەیدەبا چۆن تۆ هاوڕێی گیانلەبەرانی کەچی باسی ئەو کەڵەشێرەت نەبیستووە، کە سوارەکان لە کاتی رۆشتندا باسی دەکەن‌و چیرۆکەکەی بووەتە شەوچەرەو زمانی حیکایەت خوانان.

بەیدەبا وتی: بەڵێ باوەڕت پێ ئەکەم، لە کاتێکد هیچیشم دەربارەی ئەو کەڵەشێرە نەبیستووە! بەسەرهاتەکەی چییە؟ وا خەیاڵی منت خەریك کردووە بە باسکردن‌و پێکەنینەکەت.

مامۆستا ئەمجارە لە رووخساریدا راستی پێوە دیار بوو، وتی: ئەگێڕنەوە: پیاوێك هەبوو تووشی نەخۆشییەکی دەروونی ئاڵۆز هاتبوو، هەتا وای لێهاتبوو خۆیی لێ بوو بووە دەنکە گەنمێك ئەگەر کەڵەشێرێك ببینێت هەڵی ئەگرێتەوەو قوتی ئەدات، کەسوکارەکەی بردیانە لای حەکیم باشییەك بۆ چارەسەرکردنی‌و لابردنی ئەو خرت‌و خەیاڵە لە مێشکیدا، پزیشکی دانا چەند مانگێك هەوڵی لەگەڵادا هەتا توانی ئەو خەیاڵەی لەسەر لاببات‌و قەناعەتی پێ بکات کە مرۆڤێکی تەواوە نەك دەنکێ گەنم مریشك‌و کەڵەشێر بتوانن بیخۆن، پیاوەکەش لە دوای چارەسەرێکی درێژخایەن وای نیشانئەدا کە قەناعەتی تەواوی هەیە بە قسەکانی پزیشکی حەکیم.

پزیشك‌و كەسوكاری نەخۆشەكە بۆ ئەوەی دڵنیابن وەهمەكەی نەماوەو چارەسەرەكەی سەركەوتووە، پزیشكەكە ناردی كەڵەشێرێكی پاپۆكە سوورو پەڕو باڵ رەنگینیان هێناو داوای كرد كەڵەشێرەكە بكەنە ژوورەوە بۆ لایان، هەر كە كەڵەشێر هێنرایە ژوورەوەو پاپۆكە سوورەكەی بە لای راست‌و چەپدا با ئەداو چاوە سوورەكانی ئەگێڕا بە كون‌و قوژبنی ژوورەكەدا، یەكسەر پیاوە نەخۆشەكە بە دڵەڕاوكێ‌و رسەوە رایكرد پشتی كورسی پزیشكەكەو خۆی حەشاردا.

پزیشكەكە سەری سوڕما لە هەڵسوكەوتی نەخۆشەكە، فەرمانی كرد كەڵەشێرەكەیان بردە دەرەوەو داوای لە نەخۆشەكە كرد بێتە دەرەوە، دوای ئەوەی كە یێی گەیاند كەڵەشێرەكە رۆشتووە، پیاوەكەشی لە پشی كورسییەكەوە هاتە دەرەوە لە پاڵیا دانیشت، كاتێ: هێور بوویەوە پزیشكەكە لێی پرسی وتی: بۆچی كاتێك كەڵەشێرەكەیان هێنا هەڵپەڕیت‌و خۆت شاردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ پێشتر قەناعەتت كرد كە تۆ دەنكە گەنم نیت تا كەڵەشێر قوتت بدات؟ پیاوە نەخۆشەكە وتی: بەڵێ جەنابی پزیشك، من عەناعەتم وایە، تۆش قەناعەتت وایە، بەڵام كێ قەناعەت بكات بەو كەڵەشێرە؟

بەیدەبا تێگەیشت شێخ مەبەستی لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆكەو ناوەڕۆكەكەی چییە، زۆر پێكەنینی پێ هات، هەتا خەریك بوو لەسەر كورسییەكەی بكەوێتە خوارەوە، وتی بە شێخ: ئێستا لە ناوەڕۆكی قسەكەت گەیشتم لە بارەی ئەو هەوڵ‌و كۆششەی كە پێویستە بە كاری بهێنین هەتا خەڵكی تێبگەن مەبەستمان چییەو بۆ ئەوەی لەو كەش‌و هەوایەی كە تێیدا گەشەیان كردووەو راهاتوون لەسەری بگۆڕڕێن، چونكە سەختترین شت ئەوەیە گۆڕانی خەڵكی لەسەر ئەو شتانەی كە پێی داهاتووەو تامی خۆراكێك بكات كە ئولفەتی پێوە نەگرتووەو هۆگری نەبووە، بەڵام لە كاتێكدا ماناوراستی ئەوەی كە پێشنیاری بۆ كراوە دەركەوت‌و چێژی لێ وەرگرت‌و لە سوودەكانی تێگەیشت، ئەوە بە رەزامەندی‌و پەرۆشەوە پەسەندی ئەكات بە تایبەتی گەنجەكانیان، ئەو كاتە بینش‌و بیروبۆچوونی راست‌و دروسیانە دائەگیرسێت وەكو چۆن ئاگر لە پل‌و پووش بەر ئەدەی وەكو دەڵێن.

# ئەو رۆژەی ئاسمان زێڕ دەبارێنێت

لەم کاتەدا مامۆستای گەورە سەری داخستبوو ئەم لاو ئەو لای جلەکانی کۆکردبوویەوە، دەستی گرتبوو بە گۆچانەکەیەوە بۆ هەستانەوەی‌و خواحافیزیی لە میوانەکانی بەیدەب‌و ئەوانەی کە لەگەڵیا ئامادەبوون لە قوتابیانی زانست‌و زانیاریی، ئەوانەی ئەهاتن بۆ گوێبیستی ئەو ئاخاوتن‌و گفت‌و گۆپانەی کە رووی ئەدا لە نێوان ئەو دوو زاناو پەندیارە لە پەندیارانی سەردەم کە گەشت‌و سەفەری تایبەتی ئەکرێت بۆ دیداریان‌و گوێگرتن لە پەندو ئامۆژگارییەکانیان.

لەو کاتەدا بەیدەبا رووی کردە شێخ ئیبن بەتوتەو وتی: مامۆستای پایەبەرز! بە قسەکانت بەهرەمەندو سوودمەندت کردین، ئێمە ئەزانین کاتی زۆرمان لێ گرتوویت، بەڵام ئەشزانین چەند رێزو خۆشەویستیت هەیە بۆ شاگردانی حیکمەت‌و زانست‌و زانیاریی، هەرچەندە وا دەبینم کەمتەرخەمم لە هەقی خۆم‌و هەقی ئەم کۆمەڵە قوتابییەو ئەوەشی لێیانەوە فێر ئەبێت‌و سوود لە زانستەکەیان وەرئەگرێت لەبەر ئەوەی من هێستا ئەو پرسیارەم لێ نەکردوویت کە بووەتە خولیای سەرم‌و سەرسامم ئەکات.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: بێ پێچ‌و پەنا ئەی بەیدەبا چیت ئەوێ بیڵێ‌و روونی بکەرەوە، هەموو ماندوون‌و منیش‌و تۆش لەوان کەمتر نین، وەکو دەزانیت کاتی رۆشتن‌و جیابوونەوە نزیك بووەتەوە، ئەگەر چی ئاسان نییە جیابوونەوەی خۆشەویستان لە دۆستانی زانست‌و زانیاریی‌و حیکمەت لەم وڵاتەدا لەسەر رووی هەموویانەوە تۆ ئەی بەیدەبا، من لە گەشی ئەمجارەمدا بەرەو باشوور بەرێ ئەکەوم بەرەو سەرزەمین‌و گەلانێك کە تینووم بە خۆشەویسییان‌و ئەو ئازارانەی کە بەسەریان هاتووە، ئومێدی گەورەم هەیە کە حاڵی چاك بکرێت لەسەر رێگاو رەوشتی پێشینەکانی ئەگەر بیرمەندو چاکخوازو خاوەن پەروەردەکان هەوڵی دڵسۆزانەی خۆیان بەکار بهێنن بۆ گەڕانەوەی ئەو میللەتانە بەرەو ئوممەتێکی سەرکەوتوو و شوێنکەوتەی هەق‌و دادپەروەریی‌و بەزەیی‌و ئاشتیی‌و بڵندیی دوور لە رێگاکانی گەندەڵیی‌و خراپەکاریی‌و زوڵم‌و زۆرداری دووبارە لەو سەرزەوییەدا شارستانی راستەقینەو ئاشتیی‌و ئاوەدانیی‌و دەستەبەری‌و راوێژکاریی‌و تەبایی بونیاد بکرێتەوە.

بەیدەبا وتی: گەورەم ئەوەی کە پێشنیارت بۆ ئەکەم بە ئیزنی خوا دوایین داواکارییە، چونکە وەکو بۆم باسکردیت کە خۆم دوو دڵم لێیو ئەوەشی کە لەم مەجلیسەدایە بە هەمان شێوە.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: بەیدەبا رۆشنی بکەرەوە ئەو شتەی کە بە لاتەوە گرنگەو سەرسامت ئەکات، ئەتەوێت زیاتر ماندوومان بکەیت، یان لەبەر خاتری ئەوە لە گەشتەکەمان دوامان بخەیت، بزانە ئەی بەیدەبا پرسیاری هەرچیت کرد ئەوە باسو لێکۆڵینەوەی من ئەبێت لە کاتێکی گونجاوی تردا.

بەیدەبا وتی: ئەو شتەی گرنگە بە لامەوەو مایەی سەرسوڕمانمە کارێکە زۆربەی خەڵکیو گەلانی وەك ئێمە تیاماوونو هەرچی هەوڵیان داوە تەلیسمەکەی بکەنەوە زیاتر ئاڵۆز بووە، هەروەکو راویلکە تا بە شوێنیدا بڕۆیت زیاتر دوور ئەکەوێتەوەو بە گران دەست دەکەوێتو بە گران لێی تێ ئەگەیت.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: ئەی بەیدەبا روونی بکەرەوە مەبەستت چییە لەو تەلیسمانەت وا خەریکە فزولیمان دەردەهێنیت لە بارەی ئەو کارانەو گرنگیو گرانییەکانی.

بەیدەبا وتی: تۆ ئەزانیت ئەی مامۆستای پایەبەرز بیروباوەڕی خەڵکی ئەو بنەمایەیە کە بوونو کسانی خۆیانو کۆمەڵگاکەیان لەسەر ئەوەستێ، ئەگەر هەستو شعووریان لەگەڵ بیروباوەڕیان نەگونجاو پێچەوانەبوو ئەوا بونێتیان ئەکەوێتە لەرزەو گومانو دوو دڵیی ورەیان ئەڕووخێنێتو تینو توانایان لاواز ئەکاتو ئەو دژوارییو پێچەوانەیە بینایان ئەلەرزێنێت.

مامۆستا ئیبن بەتوتە وتی: بەیدەبا راست ئەکەیت، بیروباوەڕو عەقیدە پێویستە بریتی بن لە بنەمایەکی جێگیری توندوتۆڵو تێڕوانینێکی روونكو ئاشکراو بزووێنەری هەبێت، هەروەها بریتی بێت لە رەنگدانەوەی ئەوەی کە مرۆڤ هەستی پێ دەکاتو بەرجەستەی دەکا لە ژیانی راستەقینەیدا، ئەگەر وا نەبێت ئەوا ئەنجامێکی تەمو مژاویی دروست دەبێت لە بیرو بۆچوونیانداو تێکشکانی ورەو توانایان.

بەڵام ئەوە چۆن رووئەدات؟ ئەو گرفتانە چییە کە بوونەتە هۆی دروستبوونی ئەو حاڵەتە لای ئەو میللەتانەی کە ئاماژەت پێکردن ئەی بەیدەبای دانا؟

بەیدەبا وتی: ئەو شتە ئاڵۆزەی کە ئاماژەی پێ ئەکەم ئەوەیە ئەو میللەتانە قسەیان خستۆتە جێگای کارو کردەوە، باوەڕو قەناعەتیان وایە کە نزاو سکاڵای زۆر بۆ لای

پەروەردگار بێ هەوڵو کۆششێکی دروست بەڵاو نەخۆشییو ئافاتو دادو بێداددیان لەسەر لا دەبات، بەڵام وەکو بینراو و هەست پێکراویشە خوای گەورە وەڵام ناداتەوە، بەڵاو پەژارەو ئافات بەسەریانا دەڕژێتو زیاد دەکات بە ساڵانو دەیانو، بەڵکو بە سەدەش هەرچەندە نزاکانیان درێژە بکێشێتو لالانەوەیان زیاد بکات، ئەمەش ئەی مامۆستای گەورە وا دەکات واقیع پێچەوانەی بیروباوەڕیان بێت لە کاری نزاو پاڕانەوە بۆ لای خوای دروستکەرو بەتوانا بەسەر هەموو شتێکدا بۆ ئەوەی بەڵاو ئافاتو دادو بێدادییان لەسەر لابەرێت. پرسیار لێرەدا ئەوەیە، خەڵکی چۆن ئەو گرفتە چارەسەر بکەن لە نێوان بیروباوەڕیان بە دروستکاری بە توانا کە یارمەتی مرۆڤ دەداتو دەروویان لێ ئەکاتەوەو نێوان تێپەڕبوونی ساڵانو دەیان ساڵ بێ ئەوەی وەڵامی نزاو پاڕانەوەکانیان بداتەوە، بەڵکو بەرەو خراپتریش ئەڕواتو سەختیەکان توندتر ئەبن هاتو هاوارەکان گەورەتر ئەبن بەبێ ئومێد لە لایەن یارمەتیو ویژدانی گەورەکانیان، یان دوژمنەکانیان.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: ئەی بەیدەبا پرسیاری شتێکی گەورەت کرد کە شیاوی ئەوەیە ئەمشەو لای خۆتو براو خوشکانت دابنیشمو باستان بۆ بکەنو نەیخەمە بەیانی، بە ویستی خوا لەبەر ئەوە وەڵامی پرسیارەکانتان ئەدەمەوەو کاتی گەشتەکەشم دواناخەم، ئێستا کات نزیکبۆتەوەو دڵی گەرۆکیش بەرەو باشوور رۆشتووە کە گەردەلولێکە لە شەوقو سۆز، لەبەر ئەوە بانگهێشتان ئەکەم نانی نیوەڕۆ لە ماڵی مندا بفەرموون دوای هەندێك پشوودانو نوێژی عەسر دائەنیشین پێکەوە بۆ گفتوگۆو راگۆڕینەوە لە بارەی کاری پاڕانەوەو کەمی بەدەمەوەهاتن کە گیر بووە لێتان لە لایەن ئەو گەلە چەوساوەو ژێردەستانەی کە مەبەستانە لە جیهانی ماددی زلهێزەکاندا.

پاش ئەو رۆژە کۆمەڵەکە هەستانی بە نانخواردنو نوێژو کەمێك پشوو، هەموو بە پەرۆش بوون بۆ نوێژی عەسرو قسەکانی گەرۆك کە خۆی پێش نوێژی بۆ کردن، لەبەر زانیارییو پلەو پایەی، هەروەها لەبەر ئەوەی کە خاوەن ماڵ بوو، وەکو دەزانین پێشنوێژیی لە ماڵی کەسدا ناکرێت مەگەر بە ئیزنی خاوەن ماڵ نەبێت.

شاگردانی زانستو زانیاریی ئەڵقەیان بەست بە دەوری ئیبن بەتوتەو لە پێش هەموویانەوە فەیلەسووفی دانا (بەیدەبا) بۆ گوێبیستی دوایین قسەو پەندیارەکانی دەربارەی ئەو خاڵانەی کە جێگای گرنگی هەمووان بوو.

مامۆستا خەندەیەکی بە روویاندا کردو وەکو عادەتەکەی خۆی رووی کردە بەیدەباو دەستیکرد بە قسەکانیو وتی: خوا پاشتی چاکەی خۆتو براکانت بداتەوە، ئەو پرسیارەت خستە روو، چوویت بە دوای ئەو گرفتەدا، بەڵکو ئەم قسانەی ئێمە راستیەکی تێدا بێت ئەو گرێیانە چارەسەر بکاتو لێڵییەکەی لابداتو خەڵکی سوودی لێ وەربگرن، کەواتە خۆتو براکانت لێم وەربگرن، چونکە ناحاڵیی بوون لە کاری نزاو پاڕانەوە زیانی زیاترە هەروەکو چۆن نموونەت پێ هێنایەوە لە بارەی هەندێك میللەت کە هۆشیارییان نەماوەو ورەیان بەرداوەو خەڵکی لەوەدا دەبنە دوو جۆر: یەکەمیان ئینکاریی نزاو نهێنییە پیرۆزەکانی دەکەن، ئەوی تریان ئەیکاتە بنەمایەك بۆ جێگرتنەوەی هەوڵو کاری دروستو موسەخەرکردنی یاساو شەریعەتو نیعمەتەکان.

لە راستیدا پاڕانەوە شتێکی وای تێدا نییە کە وا بزانرێ جیاوازیی هەیە لە نێوان باوەڕو واقیعدا، بەڵکو لێرەدا هەڵەو تێکەڵاوکردنی تێگەیشتنەکانە کە بیروبۆچوونی لارو روانگەکانی بەجێیان هێشتووەو لە کەلەپووری هیچو بەتاڵە بۆیان ماوەتەوە، کە بووەتە هۆی چەواشەکردنی بینشو بەرنامەی فیکریی بە دوای ئەوانەشدا بەرنامەی پەروەردەو فێرکردن کە ئامرازو رێگایەکە بە کاری ئەهێنن بۆ ملکەچکردنی ئەم میللەتانەبەرامبەر چاوچنۆکییو زاڵ بوونو ژێر دەستەمۆکردنیان، بە شێوەیەك ئەو هۆکارانە بیناییان کوێر دەکاتو ئیرادەیان بەند ئەکاتو بە کۆمەڵ ئەیانکاتە کۆیلە، گەورەو خراپەکانیان توانیویانە هەر بە کۆمەڵ ملکەچییان بکەنو چارەنووسیان دیاری بکەن بەو شێوەی کە ئەیانەوێت، لە کاتێکدا لە بێ ئاگایی خەوو خەیاڵو خورافاتو جادوودا ئەژین، هەروەها لە ترسو تۆقاندنو سووکایەتی پێکردندا ئەژین.

ئەی بەیدەبا با بە چاوی عەقڵو بینین بڕوانینو بە پێی ئەوەی کە خوای گەورە دایناوە بۆ بوونەوەو بۆ ئەوەی رووی راستی کارەکان بزانین ئەم خەیاڵو چەواشەکارییە لا بچێت.

ئایا نازانینو باوەڕمان نییە بە یەقینی کە دروستکار زەوی دروست کردووەو خەیراتو بەروبوومی بۆ فەراهەم هێناوە، کەچی بە هەزارانو ملیۆنان ئەبینین لە برسا ئەمرن لە هەندێ وڵاتدا.

ئایا مردنی بەشێکی خەڵکی لە برسا واتە زەوی ئەوەندە رۆزیی تێدا نییە کە بەشی ئادەمیزاد بکات لە خۆراكو پێداویستییەکانی؟

هەندێك نەفامو ساویلکە کە مەخابن بڕوانامەی ئەکادیمییان هەڵگرتووە، قسە دەرئەپەڕێنن بەبێ تێگەیشتنێکی دروست بەرامبەر بیروباوەڕو هێماو رەوشو تێگەیشتنێکی راستەقینەیان نییە بۆ گونجاندنی عەقیدەو بیروباوەڕ لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەورە داینەوە لە ڕێڕەو و یاساو بەرژەوەدیی، چونکە هەموو لاسایی کەرەوەی بێگانەن یا تیاچوویەکی نەماو لە راستیدا سەرچاوەیان نەگرتووە لە زانستو زانیاریی، یان لەسەر بیرو بیرۆکەیەکی زانسیانەسەبارەت بە واقیعو یاسای سروشتو نهێنییەکانی لە بەکارهێنانو ئاسانکاریی ژیاندا لەبەر ئەوە زۆربەی شارستانییەکان نقلکراونو گوێزراونەتەوەو زۆربەی ئایینیەکان تەنیا زاراوەی تەقلیدە لە زانستو مەعریفەتو بیرۆکەو داهێناندا بنەڕەتیان نییە ئەی بەیدەبا ناوەڕۆکی ئەو گیروگرفتانەی نەتەوە دواکەوتووەکان لەم سەردەمەدا لە راستیدا گرفتی زاراوەو فیقهی نییە، بەڵکو گیروگرفتی بیروبۆچوونو بەرنامەیە کە بە پلەی یەکەم پێویست دەکات چاکسازیی لە بینشو بیروبۆچووندا بکرێت چاکسازیی لە هزرو بیردا چاکسازیی لە رۆشنبیریی‌و بەرنامەدا بکرێت.

ئەوەش بە لێکۆڵینەوەو پشکنینی سەرەکیو هەوڵو تێکۆشان ئەنجام بدرێت، کە ئەم گەلانە بە راستیەکان شارەزا بکات بە شێوەیەکی زانسیانە بەوەی کە بیرو بۆچوونەکانی بگۆڕێتو کەلێنو ناتەواوییە رۆشنبیرییەکەی پڕ بکاتەوەو چەواشەکارییەکان لەسەر بەرنامە فیکرییەکەی لا بباتو هەوڵی خۆی تێرو تەسەل بکات کە بتوانێت رووبەڕووی بەرهەڵستییەکانی بێتەوە.

بە گشتی ئەهلی زانست ئەی بەیدەبا وتەو قسەکان دووپات دەکەنەوە بە واتاو پێناسەیەکی کەمو کورت، هەر بە زاراوەو زمانو بە شێوەی سەر زارەکیی رووت راوو بۆچوونەکان هەموو بۆ ماوەنو پەیوەندییان نییە بە گرفتەکانی سەردەمو تواناو بەرەنگارییەکانی، یان بە زانستو مەعریفەتو چوار چێوە مەکانییو زەمانییەکانی لەگەڵ ئەوەشدا ناو و ناتۆرەی نەفامییو سەرپێچی ئەدەن بەسەر ئەو کەسانەی کە پێچەوانەی راکانیانەو سوورن لەسەر گوێڕایەڵی فرمانیان بەبێ قەناعەتو تێگەیشتن، یان بەرهەمێکی دیاریو باوەڕپێکراو.

ئەی بەیدەبا هزرو بیری ئەم گەلانە لەکەدار کراوە، هەروەها ویژدانی شێوێنراوە هەتا وای لێهاتووە لە کارو کۆشش وازی هێناوەو لە کاروانی ژیان دواکەوتووەو لە هاوبەشی

شارستانییو ئاوەدانیی زەوی دوورخراوەتەوە، چونکە کارو کردەوەی چاکە لای ئەوان بریتی نییە لە ئاوەدانکردنەوە لەسەر زەویدا، بەڵکو کردەوەی چاکەو پەرستشی خوا لە بۆچوونی زۆری بیر تەسکەکان بریتییە لە ورتە ورتی زمانو دانیشتن بۆ تیلاوەتو یادکردنەوەی خواو بەشداریی لە دروشمە ئایینییەکانو ئەڵقەی دەرسەکانو خۆ دەرخستن.

هەروەها چاکخوازیی (ئیحسان) ئەی بەیدەبا لە نیگای خاوەن بیر تەسکەکان پەیوەندیی نییە بە هەوڵدانو گەڕان بە شوێن هۆکارو نهێنییەکا لەم بوونەوەرەدا، یان تەکنیك لە کارداو بەجێهێنانی بەو شێوەیەی کە ماناکانی زیکر بەدی دەهێنێت، لەگەڵ ئامانجو مەبەستەکای جێنشینی مرۆڤو هەڵگرتنی ئەرکی سەرشانیو سوود وەرگرتن لە ئەقڵو زانست بۆ دروستکردنی ژیانو ئاوەدانییو ئاسانکاریی ژیانو دابینکردنی پێویستییەکانو زرۆی وەبەرهێنان کە بژێوی کرێکارانو سەرووی خۆیان فەراهەم دێنێت، هەروەها بژێوی کەسانێك پشتی ئەمانەوەن لە هەژارو موحتاجو بێ نەوایان.

کەواتە ئەی بەیدەبا چاکەکردن بریتییە لە کاری پوخت بە هەموو مانا فراوانییەکەیو خەرجکردنو بەخشندەیی بەرامبەر لێ قەوماوان کە روویەکە لە رووەکانی چاکەخوازییو ئیحسان، هەروەها باوەڕو بەدەستهێنانی خۆشەویسیی خوای گەورەو رەزامەندی روویەکی ترە لە رووەکانی ئیحسان، بەڵام ئەی بەیدەبا ئیحسانو چاکەکاری تەنیا لەسەر ئەماە ناوەسێتەوە، بەڵکو هەڵگری مانای گەورەترو فراوانترە بە هەموو بوارەکانییەوە.

خوای گەورەش کارێکی خۆش ناوێت مەگەر بە پووخشتییو بە جوانیی ئەنجام نەدرێ لە هەموو بوارەکانداو سوپاسگوزاریش لەسەر نیعمەتەکان بە پلەی یەکەم کردەوەی چاکەیە کە بریتییە لە ئاوەدانییو چاکسازیی گوزەرانی خەڵکیو کرێکاران بتوانن رۆزییو بەرهەمی خۆیان بەدەست بهێننو سوود بگەیەنن بە دەوروبەریشیان.

بەڵام ئەوەی وا یێەگات کردەوەی چاکە مەبەسی لە خوێندنەوەی زیکرو تیلاوەتو بەجێهێنانی یادەوەرییو دروشمە ئایینییەکانە، یان بەشداریی لە ئەڵقەی دەرسەکانو نەزرو خێرکردن ئەگەر توانییانو کردیان، ئەوە چمکێکی کورتە لە روانگەی گشتیی گەردوونی دەربارەی مانای ژیانو جێنشینیو بەجێهێنانی ئەرکی ئەمانەت.

کەواتە کاری چاکە کارێکە بە نیەت پاکی ئەنجام دەدرێتو هەوڵی راستەقینەی پەیڕەوکردنی یاساو رێڕەوی خواییە ئەویش بە باسو لێکۆڵینەوەو گەڕاتن بە شوێندا، ئەی

بەیدەبائێستا کاتی ئەوە هاتووە رۆڵەکانی ئەم گەلانە هێزو بازوویان هەڵکەنو ژێرییان بخەنە کار، ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی بەخشیون لە ئەقڵو تواناو لێهاتنو داهێنان بۆ ئەوەی بوونەوەر موسەخەرو تەرخان بکەن رۆزیی‌و بژێویی تیا بەدەست بهێنن بە خێرو چاکە زەوی ئاوەدان بکەنەوە بەو شێوەیەی کە خوا بڕیاری داوەو رێگاکانی لەبەردەمدا ئاسان کردوونو هەر لەبەر ئەوەش دروستی کردوون نەوە لە دوای نەوە.

بەیدەبا با بۆت روون بکەمەوە خاڵی پەیوەندیی نێوان وەحی‌و قسەی راستەقینە لەگەڵ هەقیقەتی ئەم یاسای سروشتو نموونەی زیندووت بۆ ئەهێنمەوە کە هەموومان ئەیبینین.

هەموومان ئەزانین گرتنەوەی رزقو رۆزیی لای هەندێ گەلان هەتا زۆریان تیائەچن بە هۆی برسێتی‌و نەدارییەوە، هەروەها دەشزانینو باوەڕمان هەیە بە وەحیی، رەوانەکراوو پەیامی راستەقینەو باوەڕمان هەیە کە خوای گەورە رۆزییەکی زۆری لە زەویدا دروستکردووە بۆ ئادەمیزادو هەموو دروستکراوەکانی تر.

وەکو دەزانین بە کردارو دیتنو هەستکردن ئەم سەر زەوییە زۆرێك لە وزەو رۆزیی تێدایە کە چاوەڕوانی کەسێکە بۆ دۆزینەوەی‌و دەرهێنانی‌و خستنە ژێربارو پەرەپێدانی ئەمەش ئەوەیە کە میللەتە کارامەکان ئەنجامی ئەدەن.

ئێمە ئەبینینو ئەزانین خوای گەورە ژیریی بەخشیوە بە مرۆڤو ئەرکی ئەمانەتی خستۆتە سەرشانیی‌و کردوویەتی بە جێنشین لەبەر ئەوە ـ بە ئەقڵو زانیاریی‌و کردەوەو ئیرادە ـ هەڵسوکەوت ئەکاتو بەکارە، لەم زەوییەدا بە ویستو خواستی خۆی چ بە چاکو چ بە خراپ.

ئەمانە هەمووی ئەی بەیدەبا واتە پێویستە لەسەر مرۆڤ بیربکاتەوەو فێر ببێتو بگەڕێت، چۆن زەوی تەرخان بکات بۆ خواستو پێداویستییەکانی؟ لەبەر ئەوە بگەڕێتو لێکۆڵینەوە بکات لە سروشتو سونەتەکانی بوونەوەردا بۆ پەیداکردنی پێویستییەکانی لەو قووتەی کە ئەیخواتو ئەو ئامرازو ئامێرانەی کە یارمەتی ئەدات.

هەروەها واتە: پێویستە لەسەر ئادەمیزاد بە ژیریی‌و زانستو توێژینەوە بزانێت زەوی لەبارو شیاو بۆ چاندنو کشتوکاڵو شوێنی ئەو کانزایانەی کە تیایدا دەردەهێنرێت، هەروەها پێویستە بزانێتو فێربێت چۆن ئامێرو ئامرازەکان رێك بخاتو دروستی بکاتو چۆن بەکاری بهێنێت لە کشتوکاڵو ڕاو و دەرهێنانی بەروبوومی زەویی‌و کانزاکانیی‌و تەرخانکردنی بۆ

جۆرەها پێویستیو ئاوەدانیی، خوای گەورەش داهاتو رزقو رۆزیی لەناو نهێنییەکانی زەویدا داناوە.

سەرەنجام ئەی بەیدەبا بە ژیریيو زانستو نوێسازیيو گەڕان بە شوێن نهێنییەکانی فیترەتو سروشتدا ئادەمیزاد ئەتوانێت داهاتو گەنجینەکانی زەویی موسەخەر بکات، هێزو وزەکانی کۆبکاتەوە بۆ پێویستیيو ئاوەدانییەکەی هەرچی نەوەکان تازە ببنەوەو ئادەمیزاد لە زیادبووندا بێتو زانستی فراوان بێت تواناکانی زاڵ دەبێت بۆ بەکارهێنانی زەویو دروستکراوەکان بۆ جۆرەها پێویستیيو ئاوەدانییە فراوانەکەی.

ئایا نابینی ئەی بەیدەبا ئادەمیزاد لە سەرەتادا هەتا نەیئەتوانی چۆن "لاشەی براکەی بشارێتەوە"، بەڵام ئەمڕۆ چۆن ئەیبینی بە کونو قوژبنی جیهانو بەرەو هەسارەو گەڕۆکەکانی ئاسماندا دەگەڕێت.

ئەی بەیدەبا مرۆڤ لەم ژیانەدا بۆ ئەوە دروستکراوە بیر بکاتەوەو کار بکاتو شارستانیی پێك بهێنێتو زەوی موسەخەر بکات بۆ ئاسانکردنی ژیانی، هەروەها ئەم تەرخانکردنو ئاسانکارییەش پێویستە لە پێناوی راستیيو دادپەروەریيو ئاشتیيو چاکەدا بێت نەك لە پێناوی شەڕو ستەمو دەستدرێژییدا بێت.

ئەی بەیدەبا روونو ئاشکرایە مرۆڤ سوورە لەسەر ژیان، سوورە لەسەر وەچە خستنەوە. ئەم پێداگریو سووربوونەش ئەگەر وردبینەوە پاڵپێوەنەرێکی سروشتی (فتریی)یە لای مرۆڤ کە جێنشینایەتی خۆی ئەنجام بدات لە کاتێکدا خوای گەورە مردنو ژیانی دروستکردووە بۆ بەجێهێنانی هەمـوو ئەمانەو بۆ بەردەوامیی ژیانە نەوە لە دوای نەوە، کەواتە جێنشینییو ئاوەدانیی مرۆڤ لە زەویدا بریتییە لەو غەریزەو هۆکارانەی کە خوا دروستی کردووە لە سروشتی ئادەمیزاد بۆ ئەوەی دروستکردنو بنیاتنانو ئاوەدانییو پرۆژەی شارستانیی لەسەر زەویدا بەردەوام بێت، ئەمەش روونادات مەگەر بە خۆشەویستیی ژیانو سووربوون لەسەریو سووربوون لەسەر وەبەرهێنانی نەوە بۆ نەوەی نوێو بەردەوامێتیی ژیان هەتا پرۆژەی شارستانیی مرۆڤ تەواو بکرێت لەسەر زەوی. سروشو پەیامی خوایی ئامانجی خودی خۆی نییە ئەی بەیدەبا، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە مرۆڤەکان بە ئاگا بهێنێتەوەو رێنومایيان بکات بۆ ئەرکی جێنشینیو ئەمانەتو خواستو ئیرادەی کامڵو پێگەیشتوو، بۆ ئەوەی شارستانییو ئاوەدانیی لە پێناوی چاکەدا بێت نەك خراپە، بەوەش ئامانجو مەبەستەکانی ژیانو جێنشینی مرۆڤ لە زەویدا بەدی دێت، لە کاتێکدا ئێمە بە یەقینی دەزانین زەوی

خاوەنی رزقو رۆزیی خۆیەتیو لە مەبەستەکانی هەقیقەتی جێنشینی ئەوەیە مرۆڤ ئەم رۆزیانە بەکاربهێنێت بۆ بەرژەوەندییو خۆشگوزەرانیی خۆی.

ئەی بەیدەبا لەوانەی کە رابوردو باسمان کرد بۆ مان دەردەکەوێت بەبێ گومان رەوشتی خوای گەورە بەرامبەر دروستکراوەکانی ئەوەیە ئەوەی تەمەڵی بکاتو دەستەوسان بێتو بیرنەکاتەوەو کار نەکاتو تەنیا پشت ببەستێ بە خوا ئەوە شیاوی ئەوە نییە بخواتو چێژ وەربگرێتو سوودمەند بێت بە خێرو بێرو نازو نیعمەت لە ئاکامدا ئەو چارەنووسەی کە خۆی هەڵیبژاردووە ئەوەیە لەگەڵ هاوچەشنەکانی وەك خۆی لە نەخۆشییو برساندا بمرن، زۆرێك لەوانە لە هەژارییو نەدارییدا رەشو رووت ئەبن، ئایا رەشو رووتیو نەخۆشییو مردنی ئەوانە لەو راستیانە ئەگۆڕێت کە زەوی رۆزیی ئەوانیشی تێدایە ئەگەر بە ژیریی و زانستو کردەوە داهاتو رۆزییەکانی دەربهێننو پەرەی پێ بدەن، کەواتە جیاوازیی ئەوەیە جیاوازیی لێرەدایە نەتەوەیەکدا کە داهاتەکان دەرئەهێنێتو بەرهەم دەهێنێتو بە کاری دەهێنێت، بەڵکو زۆریشیان بە داخەوە زیادەڕەوی ئەکەنو بڕێژو بپێژن لەگەڵ نەتەوەو گەلێکی تردا کە دەستەوسانو دواکەوتوو و هەژارو نەدارن، کەواتە هەژارییو نەداریی لە رۆزییو بەروبوومی زەویدا نییە، بەڵکوهەژارییو دەستەپاچەیی لە دەروونی ئادەمیزادەکاندا هەیە.

نموونەیەکی تر ئەی بەیدەبا سەبارەت بە سامانی ناو زەوی وەکو دەزانین زۆرێك لە کانزای بە سوودی تێدایە نموونە وەك کانزای بەنرخی ئاڵتون، بۆ ئەوەی مرۆڤ دەسی بکەوێ پێویستە شوناسی هەبێت بۆ دیاریکردنی ئەو شوێنانەی ئەم کانزایەی تێدایە، پاشان ئەوەندە توانا و زانیاریی هەبێت بۆ دروستکردنی ئەو ئامێرانەی کە چەو و تاشە بەردەکان بشکێنێت لە ناو جەرگەی زەویو سکی شاخەکانداو ئەو خۆڵو بەردانە دەربهێنێت کە ئەو کانزایەی تێدایەو جیای بکاتەوە لە خڵتەو خاڵەکانی هەروەها توانای هەبێت بۆ بەکارهێنانی ئەو کانزایە بۆ پێویستییو پیشەسازییو خشڵو جوانیی ئافرەتان.

ئایا باوەڕت هەیە ئەی بەیدەبا ئەوانەی بە شوێن ئەم کانزایە دەگەڕێن دانیشن سەدان ساڵ بپاڕێنەوە لە خوا ئاڵتونیان بۆ دەربهێنێت لە ناو جەرگەی زەویو شاخەکاندا، بێ ئەوەی خۆیان ماندوو بکەنو سەختی بکێشن، ئایا شتی وا رووئەدات ئەی بەیدەبا ؟!

بەیدەبا وەڵامی شێخی دایەوە: بە دڵنیاییەوە نەخێر ئەی مامۆستای پایەدار، هەروەکو بە تەجرەبەو بینینیش دەزانین لە کردە نەداری نابێت، لە فەرامۆش کەردەش هیچ بە دەست

نایەت، رەوشتی خواش بەرامبەر دروستکراوەکانی ئەوەی هەوڵ بدات دەسی دەکەوێت "مَن جَدَّ وجَدَ" پێویستە لەسەرمان بە ئەرکی سەرشانمان هەستین بە بیرکردنەوەو پشکنین‌و لێکۆڵینەوەو ئەنجامدان، چونکە دڵنیاین "ئاسمان نە زێڕو نە زیو نابارێنێت" هەروەها نە نان‌و نیعمەت نە فڕۆکەو نە دەبابەو نە رۆکێت نابارێنێت.

بێگومان جێگیرکردنی جێنشینیی‌و شکۆیی‌و هێزو توانای مرۆڤ لەسەر زەویدا تەنیا بە دانیشتن بۆ ورتە ورتی زمان‌و مشتومڕو بەجێهێنانی بۆنەو دروشمەکان نییە، بەڵکو بە هەوڵ‌و کردەوەی وردو پوختە بەو مەرجانەی کە خوای گەورە دایناوە بۆ دروستکراوەکانی، کەواتە بەبێ تەقەلاو کاری دڵسۆزانە لە کارگەو پیشەسازیی‌و کیڵگەو قولایی کان‌و دەریاکان، بەبێ خۆگریی لە شوێن‌و جێگاکانی دەرس‌و لێکۆڵینەوە بە درێژایی شەوو رۆژ نە زێڕو نە زیو نە نان‌و نە هێزو تواناو نە پلەوپایەو نە جێگیربوون بە دەست نایەت.

ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە لە ژیاندا کە هیچ پەنایەکی تێدا نییە، هەرچی دەستەوسان‌و تەوەزەل‌و گەورە گێلەکانیش لەسەری بڕۆن.

بەیدەبا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، وتی: بەڵام ئەی مامۆستای گەورە ئەگەر ئێمە تەسلیم بووین‌و دیتمان کە رەوشتی خوا بەرامبەر دروستکراوەکانی بەو شێوەیەیە کەواتە ئەی نزاو پاڕانەوە یانی چی؟ ئایا شتێکی خەیاڵیی‌و دروستکراوە پێویستمان پێی نییە؟ ئەگەر وەهەو خەیاڵ نییە کەواتە شوێنی لە رێڕەوی ژیاندا چییە؟ چ پلەیەکی هەیە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە خوای گەورەوە لەم ژیانەدا؟

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: بەڵێ ئەی بەیدەبا پاڕانەوە هەیە دوور لە راستییە، پاڕانەوەش هەیە راستییە، بەڵام روونکردنەوەو درێژەی ئەم وتەیە ناتوانین بەردەوام بین لەسەری، چونکە ماندووین؟ لەبەر ئەوە با هەندێك ئاو میوەو گوڵاو بخۆینەوە لەگەڵ حەڵوای کونجیی‌و نانی گەنم، پاشان دێینە سەر باس‌و گفتوگۆ دەربارەی هەقیقەتی پاڕانەوە دوای نوێژی ئێوارە.

خزمەتکارەکەی شێخ بە پەلە چوو بۆ ئامادەکردنی شەربەت‌و ئاو میوە کە ئامادەبووان زۆر بە لایانەوە بە تام‌و چێژ بوو، ئەویش بە هۆی شارەزایی‌و هاوڕێیەتی شێخ لە ئامادەکردنی جۆرەها خواردن‌و خواردنەوەی بە تام.

# پاداشت بۆ تەمبەڵو ستەمکار نییە

دوای ئەوەی هەموان لە خواردنو خواردنەوە بوونەوە، هەندێك پشوویان داو دوای نوێژی ئێوارە دیسان ئامادەبووان یەکیان گرتەوە بە دەوری شێخدا لە پێش گشتیانەوە بەیدەبای دانا.

شێخ وتی: ئەی پەندیارو دانا، ئێمە لە خاڵی نزاو پاڕانەوەدا راوەستاین کە ئایا شتێکی خەیاڵیی دروستکراوە، یان راستەقینەیەو هێزو تینێکە بۆ مرۆڤی باوەڕدار، باسمانکرد کە پاڕانەوە هەم راستیەکەو هەم دروستکراویشە.

ئەی بەیدەبا، پاڕانەوە دەکرێت ناڕاستو خەیاڵیی بێت تەنیا لای ئەوانەی ئەقڵی خۆیانو متمانەو هەڵسوکەوتو رۆشتنیان بەستۆتەوە بە چەند زمانو چەرخانێكو ورتە ورتێك لەگەڵ تەمبەڵیی‌و دەستەوسانیی لە سوچێکی ماڵیاندا دائەنیشن چاوەڕوانی دوعا خەیاڵییەکانیانن کە لە ئاسمانەوە نانو زێڕو زیویان بۆ بباریێت کەوابێ ئەم جۆرە کەسانە وەڵام نادرێنەوە.

بەڵام هەقیقەتی پاڕانەوە شێکی ترە، بەڵێ ئێمە ئەزانین نزای راستەقینە لە مرۆڤی راستەوە هێزو تینە، چونکە دەزانین خوا دروستکارو بەڕێوەبەری گەردوونەو یاساو رێڕەوی بۆ داناوەو هەر خۆی وردبینو شارەزاو خەبیرە.

تۆ دەزانیت ئەی بەیدەبا پێشینەی ئەم گەلانەی کە ئەمڕۆ دەستەو ئەژنۆ دانیشتوونو وازیان لە فرمانی بەسوودو بەرهەمدار هێناوە لەگەڵ ئاوەدانکاریی‌و نوێسازیی‌و تەکنەلۆجیا، لە کاتی خۆیدا میللەتانێك بوون خەڵکییان هانئەدا لەسەر کارو هەوڵو تێکۆشانو هزرو فیکری زیرەکانەیان ئەخستەگەڕ بۆ ئامادەبوون لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێك بوون زۆر بە پەرۆش بوون بۆ خۆشەویستیی خوای گەورەو رووکردنە خوا بە نزاو لالانەوە هەر لەبەر خۆشەویستیی‌و داوای یارمەتی لەو کە ئیلهامی راسیان بخاتە دڵەوەو کاروباریان ئاسان بکاتو سەختیی‌و بەڵایان لەسەر لابەرێت بە تواناو داناییەکەی خۆی لەبەر ئەوە ئەی بەیدەبا کەسێك بوون رووی نزایان لە خوای گەورەو زانا بوو لە دوای ئەوەی کە هەوڵو کۆششی خۆیان ئەکرد پشتیان بە خوا ئەبەستو دەستەوسان نەئەبوون، ئەوە مانای پاڕانەوەیە ئەی بەیدەبا کەواتە دوعای وەرگیراو یارمەتیی باوەڕداری تێکۆشەری دڵسۆز ئەداتو رێی راستی بۆ ئاسان ئەکاتو هەر چییەك لە چاکی هەردوو دنیا بێت خوای گەورە بۆیان ئاسان ئەکات.

ئەی بەیدەبا ئەم خستنە ناو دڵو یارمەتیو لوتفی خواییە پاداشتی باوەڕدارو کارو کۆششی گەورەیە، بەڵام کەسێك تەنیا پیشەی ئەوە بێت هەر بە تەمای خوا بێت لەگەڵ ئەوەشدا کەمتەرخەمو دەستەپاشەو کات بە فیڕۆدەر بێت هەر وەك ئەو خراپکارو زۆردارە وایە نە پاڕانەوەیان پەسەندەو نە پاداشتیان هەیە.

باش بزانە خوای گەورە ژیانو مردنی دروستکردووەو کاری جێنشینی راسپاردووە بە ئادەمیزاد بۆ ئەوەی بزانێ چۆن کارەکانیان ئەنجام ئەدەن، خواش کەسێکی خۆش دەوێت بە پێی توانای کاری چاکە بکاتو بە نیەت باشیو پوختی ئەنجامی دبات، هەروەها پاداشتی ون نەکات لە دونیاو رۆژی دواییدا.

لەبەر ئەوە ئەی بەیدەبا نزای وەرگیراو لای خوای گەورە پاداشتی باوەڕداری بەکارو ماندووە کە ژیریی خۆی بەکار ئەهێنێت بۆ کردەوەی چاکەو سوود ئەگەیەنێت بە خەڵکی، بەڵام زۆردارو کەمتەرخەمو تەمبەڵو بێکار خاوەن پاداشت نین، نە ئەوانو نە نموونەی وەك ئەوان ئەمە دادپەروەرییەو خواش ستەم لە هیچ کەسێك ناکات، هەروەها بەشو چارەنووسی ئەوەی هەنگاوی راست ئەنێتو هەوڵ ئەات خاوەنی دوو جار پاداشتەوە ئەوەی لە هەوڵەکەیدا هەڵە ئەکات یەك پاداشت واتە ئەو باوەڕدارەی کردەوەیەکی چاکە ئەکاتو دروستە ئەوا بەروبوومەکەی لە دونیا سەرکەوتنو بردنەوەیەو لە رۆژی دواییشدا قبوڵکراو و براوەیە، بەڵام ئەوەی کردەوەیەك ئەنجام ئەدات، بەڵام لەگەڵ ئایینو فیترەتدا نەگونجاوە ئەوا بەرهەمی لە دونیا نییە، بەڵام لە رۆژی دواییدا کارەکەی پەسەندکراوە لەبەر پاداشتی نییەت باشی کە بە توانای خۆی هەوڵو تەقەلای پاکانەی خۆی داوە، نموونەی ئەم جۆرە کەسانە پاڕانەوەو نزایان وەردەگیرێ لە کاتێکدا پەنابەرێت بۆ خوای گەورە کە هەوڵو تێکۆشانی بە راست بگێڕێو کارەکەی سەربخات بۆ ئەوەی پاداشتی هەردوو دونیا بباتەوە.

بزانە ئەی بەیدەباو باش بزانە بە دڵنیایی کەس بە هەڵەتا نەبات لە کەسانی ناحاڵیو کاڵ فامیی دەربارەی سروشتو تێڕوانینو بیرو بۆچوونی گشتی بەرامبەر ژیانو بوونەوەو، ئەی بەیدەبا پێشکەوتنو گەشەپێدانی زانیارییو ئاوەدانیی پێویستیی بە هەوڵی گەورە هەیە، بەڵام پەکخستنو کۆسپو تەگەرە لە بەردەم چاکسازییو ئاوەدانییو لەگەڵ دواکەوتن هەموو ئەمانە ئازارو هەژارییو لاوازییو نەگبەتیی بەدەست دەهێنێتو پێویستی بە هەوڵی گەورەتر هەیە، ئەی بەیدەبا لە کاتێکدا ئەم گەلانە بیروبۆچوونە گشتییو باوەڕە

دروستەکەیان ئەگەڕێننەوە ئەو کاتە مانای ژیان دەزانێت کە چاکەکردنو کاری پوختو بەکارهێنانیو خستنەژێرباری بوونەوەر دەزانێت بۆ سوودگەیاندنە بە خەڵکیو کۆکردنەوەی ڕێگاکانی خێرو چاکە لەم زەوییەدا بەو ئامڕازو هۆکارە زانستو سوننەتیانەی کە خوای گەورە دایناوە، چونکە ئەی بەیدەبا خوا مرۆڤی دروستکردووەو زەوی پێ ئاوەدان کردۆتەوە، داوا لە نیشتەجێکانی زەوی دەکات لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا هەڵگری ئەرکی ئەمانەت بن بۆ ئەوەی ڕێنوماییان بکات بەرەو ڕێگای ڕاست نەك دانیشتن لەو ڕێگەیەدا، کەواتە پەیامی نێردراو بۆ ئەوە هاتووە خەڵکی زیندوو بە ئاگا بهێنێتەوەو خواستو ویستو هەوڵیان کامڵ بکات، بۆ ئەوە نەهاتووە ئەقڵەکان کۆتو زنجیر بکاتو دەستەوسانیان بکاتو جەستەیان لەکار بخات بە خەیاڵاتو شتی پڕو پووچو ورتە ورتی زمان خەریکیان بکات، ئایا بەیدەبا تێگەیشتی ـ بەو نموونانەی بۆم باسکردیت ـ ڕاستیی مانای نزاو پاڕانەوە ئەوانەی ئەهلی پاڕانەوەن کێن بۆچی خوای گەورە نایەت بە دەم داوای زۆردارو خراپەکاران، هەروەها پاڕانەوە نییە بۆ تەمبەڵو کات کوژو کەمتەرخەمو ئەوانەی تەنیا بە تەمای خوانو هەمیشە کاری خۆیام دوا ئەخەن.

ئەی بەیدەبا نزای ڕاستەقینە لە ناوەڕۆکدا لە سۆزو میهرەبانیی خواوە دەرئەچێت کە هێزو تینێکە بۆ گیانو داوایەکە لە لوفی خوا بۆ یارمەتی هەوڵو کۆششی بڕواداران، ئەوانەی کارو کردەوەی چاکە ئەکەنو شیرینکاریی ئەکەن، یارمەتی داماوانو ڕێگای ڕێبواران چاك دەکەنو پارێزگاریی شوێنە گشتییەکان دەکەنو کشتوکاڵ دەکەن، تەنانەت باڵندەش سوودی لێ وەردەگرێ، دەرمان دروست دەکەن کە شیفای نەخۆشیی تێدایەو (بە ئیزنی خوا)، نوێسازیی دەکەن کە لە داهاتەکانی کۆمەڵگا پەرەپێ دەدەنو ئامێر دروست دەکەن کە پێداویستییەکانی خەڵکی ئاسان بکات، هەموو ئەمانەو جگە لەمانی تریش چاکەکردنەو کردەوەی جوانە لەم ژیانی دونیادا.

هەرچەند مەبەستو نیەت جوان بێت کردەوەی چاك بە هەموو جۆرەکانیەوە پەسەندکراوەو خوای گەورەش بە پێی وزەو توانا تەکلیف دەکات.

ئەی بەیدەبا لە کاتێکدا ئەم گەلانە بیروبۆچوونو جێنشینییە شارستانییەکەی ئەگەڕێنێتەوە وەك پێشووی سەردەمی خۆی لە پیاو چاکانو بیناسازانی تێکۆشە ئەو کاتە پاڕانەوەیان ماناو ڕاستیی دەبێت، بەڵام ئەوەی چاوەڕوانی ئاسمان بکات زێڕو زیو و نانو

هێزو بڵندیی‌و ئاوەدانیی ببارێنێت پاڕانەوەی ئەنجامی نابێت هەرچەند هاوار بکات‌و دەستی بەرز بکاتەوە، ئەمە رەوشتی خوایە بەرامبەر دروستکراوەکانی **"وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً"**.

قورئان‌و پەیامی خوایی هاتۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی رێنیشاندەرێکی گشتی‌و مامۆستا یەك بێت کە مەبەست بیرو بۆچوونەکان روون ئەکاتەوە، یارمەتی کارە چاکەکان ئەدات، کە خەڵکی بە ئاگا ئەهێنێتەوە، دەلیل‌و رێنیشاندەریش جێگای کار ناگرێتەوە هەروەها فەرپیش لە باسێکدا نییە کە هانی بیرکردنەوەو دەرس‌و توێژینەوە نەدات کە بەرهەمەکەی کارو تەکنەلۆجیاو ئاوەدانی‌و موسەخەرکردن نەبێت بەچاکەو سود بە خاوەنەکەی‌و خەڵکی نەگەیەنێت‌و زیندویان نەکاتەوە. توانای ژیریی‌و فیکرو نوێسازی، لەگەڵ توانای کارو تەکنیك ئەو هۆکارانەیە خوا لە سروشتی مرۆڤدا دروستی کردووە، بۆ ئاوەدانکردن، وەزیکرو پەیامی رەوانەکراو رێنیشاندەری کارە لەگەڵ ڕووە چاکەکانیدا هەر کەس پەنابەرێت بۆ خوێندنەوەی‌و پەڕەکانی هەڵبداتەوەو وشەکانی بلێتەوە بەڵام بەبێ جێ بەجێ کردنی‌و ئیش پێکردنی ئەوە لەداواکەیدا بەهەڵەدا چووەو لەبەڵگەو مەبەستەکانی لایداوە.

نمونەی ئەومیللەتە سەر گەردان‌و بێ ئاگاو دەستەپاچانە، وەك کەسێك وایە ئامێرێکی بدرێتێ بۆ ئەوەی رێکی بخات‌و بیخاتە گەڕ، هەتا کەڵك‌و بەرهەمی هەبێت کەچی دەلیلی ڕێك خستنەکەی دەخوێنێتەوەو چەند جارێك دووبارەی ئەکاتەوە، ئامێرەکەشی لەولاوە فڕێداوە هەتا ژەنگ هەڵدێنێت‌و لە بیری ئەچێت چۆن بەکاری بهێنیت‌و سودی لێ وەربگرێ. ئەی بەیدەبا ئەو بێ ئاگاو دەستە پاچانە چەند ووتەو قسەیان زۆرە وە چەند کردەوەو بەرەو پێش چونیان کەمە،چەند قسەیان زۆرەو چەند بێ کردەوەن هەروەك لەجیهانی ئەمڕۆو تواناکانی نمونەیەك بن لەپەك کەوتەیی‌وکەم تەرخەمی‌و داماوی ئەی بەیدە با ئایا راستەو چاوەڕوانی خێری لێ دەکەیت کەسێك لە گۆشەیەکدا یان لەسەرە رێیەکدا دائەنیشێت‌و یادی خوا ئەکات‌و پاروی نانی پێ پەیدا ئەکات ؟ ئایازیکر لەبەرئەوەهاتووە ؟

چەند هەوڵی تەمبەڵ‌و گۆشەنشینان بێ ئەنجامە هەرچەند خۆیان دەربخەن‌و زمان بجوڵێنن، چونکە خێر لەکەسێکدا نی یە کەزیکر بکات‌و زیکرەکەی هانی نەدات بۆ کردەوەی چاك‌و سودمەند و بەبیرو کردەوە هەوڵی باش کردنی کارو بارو زیاد کردنی فەرو پیت‌وڕۆزی نەدات بۆ بەکار هێنانی ئاسان کردنی ژیان‌و فەراهەم کردنی پێویستی یەکان ئایا ئەومیللەتانە ئەمرۆ بەدواکوتن‌و کەمتەرخەمی‌و بێ دەسەڵاتی بەڕاستی لەمانای هاتنە خوارەوەی پەیامی

خوایی تێگەشتوونە وەئەوەی کردوویەتی بەئەرکی سەرشانیان کەڕابەرێکە بۆپەیامی مرۆڤ لەژیاندا وەگرنگی بوونی نەوە بەدوای نەوە لەم سەرزەویەدا. ئایا پرسیارمان لە خۆمان کردووە بە راستی بۆچی هەرچی رەنجی ئەم گەلانەیە بەبا ئەچێت؟ئایا بەباشی تێگەیشتووین چۆن قسەی لەگەڵدا بکەین؟ لەبارەی چییەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکەین؟ وە بۆ کام رێگا رێنومایی‌و ئاڕاستەی بکەین گرنگی بوونی مرۆڤ لە زەویدا کەتێ بینی ئەکەین‌و قورئانیش هەواڵی داوە بنیات نەرێکە بۆ شارستانی‌و ئاوەدانی‌و خوای گەورە لەسروشتی مرۆڤدا سوربوون لەسەر ژیان‌وحەزکردن لەسەر وەچە خستنەوە نەوەبەدوای نەوە بەشێوەیەك نەوەیەك دەمرێت‌وژیانی کۆتایی پێ دێت ئەرکەکانی رادەوەستێ پاشان نەوەیەکی نوێ دێت‌و بەردەوام ئەبێت لەسەر کارو داهێنان‌و پاك بەڕەو رەوەی شارستانی‌و ئاوەدانیەوە ئەنێت هەتا پرۆژەی ئاوەدانی مرۆڤ لەسەر زەویدا تەواو دەبێت‌و پرۆژەی جێ نشینی مرۆڤ کۆتایی دێت کەتەنیا خوای گەورە دەمێنێتەوە.پێم بڵێ ئەی بەی دەبا ئایا گەلانی سەرزەوی هەرلەکۆنەوە تائێستا چۆن ڕوبەڕوی پێدا ویستی یەکان ـ نیان بوونەتەوە و رۆژی خۆیان پەیدا کردووە و فێری رۆڵەکانیان کردووەو پاراستونیانن لەنەخۆشی‌و بەلاوکارەسات ئایا هەربەهەوڵ‌و کۆشش‌و داهێنان نەبووە کەبریتی بوون لە شارستانی کەواتە ئەم شارستانیانەش دروست نابن مەگەر بەبەکارهێنانی ژیری‌و زانست‌و لێکۆڵینەوە وناسینی یاسای بوونەوەرو گەڕان بەشوێن هۆکارەکاندا. ئایا بوونی مرۆڤ لەم سەرزەویەدا زۆر پێویست نی یەو لە گرنگترین ئەرکەکانی نی یە پڕکردنەوەی پێویستی یەکانی‌و سەرخستنی ژیانی بەمەرجێك کاری چاکە بکات ئایا مەبەست وئامانجی قورئان نییە کە پێدائەگیرێت لەسەر ئەمجۆرەکارانەو هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی وبەجێهێنانی ئەرکی جێ نشینی وهەڵگرتنی ئەرکەکانی ئەمانەتی بەشێوەیەکی راستەقینەئایائەم جۆرەکارانە وهەرکارێکی تر لەشێوەی ئەمانە ئەگەر بەپوختی‌و نیەت چاکی بکرێت لەگەڵ بەکارهێنانی تواناو هەوڵ‌و چاکەو وردەکاری کاری چاکە نییە کە ئەویش ئامانجی زیکرو قورئانە؟

لەسەر ئەم گەلانەو خاوەنی فیکرو زانست و رۆشنبیری ئەی بەیدەبا پێوستە چاوبخشێننەوە بەتێگەشتنیان دەربارەی ژیانی مرۆڤ و تیڕوانینی و بیرو بۆچوونی گشتی گەردونی هەتا پرۆژەی شارستانی مرۆڤو جێنشینە ـ کەی تەواو دەبێت‌و ئەبێتە (دروێنەیەك کە هەر وەکو دوێنێ بە پێوە نەبووبن)، وەجیهانی خاك و زەوی کۆتایی پێ دێت بەرەو جیهانی ئاسمان و رۆح، هەرکەسێك بەپێی کارو کردەوەی خۆی پاداشت وەرئەگرێت

(ئەگەرچاکەی کردبوو چاکە ئەبینێتەوە ئەگەرخراپەشی کردبوو خراپە)، (وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيراً) (النساء : ١٢٤ )

ئەی بەیدەبا کاری دروستبوونی مرۆڤایەتی بەگشتییو پێشکەوتنییو رۆڵی لە ئاوەدانیو دروستکردنی شارستانیو خستنە ژێر باری بوونەوەر بۆپێویستیەکانی ئادەمیزاد هەربەو شێوەیە کەمرۆڤێکی تاکی لێ دروست بووە لەگەڵ پێشکەوتنیو رۆڵی لەو شتانەی کە باسمان کرد. ئەی بەیدەبا یەکەی مرۆڤ و تاکێك وێنەیەکی بچوکراوەی مرۆڤایەتیە هەروەك مرۆڤایەتیشو ێنەیەکی گەورەکراوو درێژکراوەی تاکەو هەریەکێك لەنەوەی مرۆڤ هەروەك چۆن تاکە کەسێك بە بچووکیولاوازیو بێ ئاگایی لەدایك دەبێت کە هیچ نازانێت پاشان کەم کەم گەشە دەکات بەهێز دەبێتو فێر دەبێتو دەرك ئەکات بە پێی قۆناغو هەنگاوەکان هەتا بە تەواوی خۆی دەرێژێتو پێ ئەگات توانای دەرئەکەوێتو بەرهەم دەهێنێو داهێنان دەکات پاشان گەورەترین شتی خۆی دەبەخشێت کە بە مردن کۆتای دێت، مرۆڤایەتیش هەر بەو وێنەیە کە لە پێشدا تۆوێکی سەرەتاییە کە لە پێشدا هیچ نازانێتو توانای بەسەر هیچدا ناشکێت وردە وردە بەپێی قۆناغەکان گەشە ئەکات بەپێی گەشەی ئاوەدانیو گەشەی شارستانی مرۆڤایەتی هەروەها لە گەڵیدا تواناو زاڵبوون بە سەر دەورو بەریدا پەرە دەسێنێت بە چەندێتیو چۆنێتی وە هێشتاش مرۆڤایەتی هەر لە گەشەدایە لەگەڵ شارستانیو تواناکانی، دیسان هەربەردەوام دەبێت هەتا تێرو تەسەلو تەواو دەبێت پاشان پێویستە ئەو شارستانییەتە کۆتایی بێت، لەگەڵیدا مرۆڤایەتیو جیهانی هەسارەی زەوی وەکو هەر کائینێکی زیندوو لەم بوونەوەرەدا کەواتە هەموو کائینێك لەو رۆژەی ئەگاتە چڵە پۆپەو مەبەستەکەی ئەجەلی کۆتایی دێتو دەفەوتێ. لەبەر ئەوە ئەی بەیدەبا گرنگە بۆ تاکو گەلو نەتەوەو هەوڵو بەشدارییە شارستانییەکەیان لە ئاوەدانی بوونەوەردا لە کاتێکدا مەلە ئەکەن لە تاو قولای ژیانو ئاوەدانکاری بزانن بەلگەو پاڵپێوەنەری ئەو هەوڵدانو بەشدارییە وەسەیری کۆتاییەکەی بکەن ئایا ئەو جێ نشینییە لە پێناوی خێرو راستیو دادپەروەریو سۆزو ئاشتیيە یازاڵبوونی زوڵمو توندو تیژیو خراپە کاری؟ ئەی بەیدەبا پێویستە لەسەر نەتەوەو گەلان پەندو ئەزموون وەربگرن لە ژیانی گەلانی پێشوی خۆیان هەروەکو پەند وەرئەگرێ لە ژیانی هەر تاکێك تیایدا. کارو کردەوەیان پاشا رۆژو چارەنوسیان ئەگەرنا ئەوا هەموو بەد ئاکامو پەشیمانو زیان مەند دەبن لەوەشدا تاكو گەلو نەتەوە یشیان بە شانی یەك بەشدارن تیایدا، ئەی بەیدەبا تۆ شتو مەکی گرانبەها لە کوێدا دادەنێیت؟ ئایا لە

شوێنی گرنگی ماڵەکەتدا داینانێیت،وە لە شوێنی ڕێزدارو بەرزدا؟ ئەی ئایا زبڵو پیسی لەکوێدا دادەنێیت؟ ئایا بە بۆنە ناخۆشەکەی دوری ناخەیتەوە لە خۆتو لە زبڵدان داینانێیت؟ ئایا شیاوە لەشوێنی تردا دابنرێت؟ ئایا نمونەی ئەمە هەر لە چارەنوسی مرۆڤیشدا نەنوسراوە وەلە جیهانی رۆحدا هەمان بەرهەم نابینێتەوە بۆ کەسێك دەرونو مەعدەنی خۆی بەخاوێنی ڕادەگرێتو کردەوەی چاکە ئەکات لە ژیانی دنیادا بە پێچەوانەشەوە بۆ ئەو کەسەی خراپە ئەچێنێت ئەی بەیدەبا گرنگ ئەوەیە وابکەین لەنەوەکان دەرك بکەن بە جێ نشینی خۆیان لە زەویدا کە لێکدانەوەیەکە بۆ سروشتی دروست بوونیانو پێناسەیەکە لە واقعی بوونیان وەکو خوای گەورە ویستویەتی لە ئەسڵی هاتنە دنیای مرۆڤو سروشتو **فیطرە**تی. واتای ئەمانەتیش بریتی یە لە خواستو ئیرادەکە خوا لە فیترەتی مرۆڤدا دروستی کردووە هەردوکیان لە نێوان خێرو شەڕدا کێشەیانە وە بریتییە لە هەڵبژاردن لە نێوان یاسای دارستان کە هەق بۆ هێزە لەگەڵ یاسای ڕۆح کە هێز بۆ هەقە، هەڵگرتنی ئەرکی ئەمانەتیش کارێکی گەورەیە، واتە مومارەسەی مافی هەڵبژاردنو هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە ژیاندا چ بە چاك چ بە خراپ، ئەقڵو زانستیش تەنیا ئامرازێکە کە خوا داویەتی بە مرۆڤ بۆ کارو کردەوەو بنیاتنانو تەسەڕوف کردن، جا یان دروستکردنی شارستانیو ئاوەدانیو نوێسازیەکی باش دەبێت ئەبێتە هۆی بەرپابوونی کۆمەڵگایەکی دادپەروەرو دەستە بەریو بەزەییو ئاشتی یاخود شارستانیو ئاوەدانیو نوێ سازییەکی خراپو گەندەڵ دەبێت ئەبێتە هۆی دروست بوونی کۆمەڵگایەکی لێك هەڵوەشاوی شەڕەنگێزو بێ سەرو بەر. ئەوەیە ترازوی جیاکەرەوە لە بەجێ هێنانی کاری جێنشینیو ئەرکی ئەمانەت، هەروەها مانای بوونی مرۆڤ لە سەر زەویدا ئایا کەسێکی چاکسازە، یان خراپسازە؟ خوای گەورەش ستەم لە کەس ناکات، هەروەها زیکرو ڕێنومایی کردن پێویستە بە هەموو شێوەکانیەوە روونو ئاشکرا بێت بۆ ئاگادار کردنەوەی مرۆڤ ووتارو گوفتاری بانگخوازان نابێت توندو تیژو کیناوی بێت کە ئیرادەو خواستو ژیریو تەسەڕوف پوچەڵ بکاتەوە، بەڵکو دەبێت ڕێنیشاندەرو بیر خستنەوەی راستیو خێرو چاکەو روناکی بێت بەو شێوەیەی کە گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی ئادەمیزادو تا مەزرۆبن بۆیو هۆشیار کەرەوەیەك بێت بۆ چاکسازی کە ئامانجی مرۆڤی سەر راستو تێکۆشانێتی بەمەش مرۆڤ خۆی دروست دەکاتو هەڵەکانی بەر بەست دەکات ئەی بەیدەبا ئەمەش مانای وایە یاد کردنەوەو پەیامی خوایی شتێکی زۆرە ملێ نییە هەروەها فەرمانێك نییە کە قورسایی بخاتە ئەستۆو هەڵنەگرێت وەکو

لەزۆربەی وتارو گوفتارەکانی ئەمڕۆدا ئولفەتی پێوە گیراوە! بەڵکو بریتییە لەنیشاندانی ڕێی ڕاستو یاد خستنەوەو کامڵ کردنی خواستو ئیرادەو هزرو کردەوەی خەڵکی بەوەی کە بێداریان ئەکاتەوەو سودیان پێ دەگەیەنێتو ڕێزو گەورەییان ئەپارێزێتو لەبارە لەگەڵ سروشتیانداو خۆراکی گیانیانە. کەواتە ڕست نییە فەهمەکان لە خەڵکی بشێوێنرێت، یان بەپێی ئارەزوو لێکدانەوەی بۆ بکرێت بە شێوەیەك هۆشیاریان سست بکرێتو هەوڵو ووچانیان لە قاڵب بدرێت هەروەها توانای بیرو هۆشو لێکۆڵینەوەو داهێنانیان خەفە بکرێت بەیدەبا وتی: ڕاستت ووت مامۆستای پایەدار ئێستا نهێنی ئەو ئەزمەیەی زۆربەی میللەتانی تێکەوتووەو هۆی دواکەوتنیانو دورخستنەوە، یان لە ڕۆڵی شارستانیانو بوونەتە گەلانێکی بخۆرو دەستەو سانو دانیشتو کە لە سەرەتادا سەرکردەو سەر قافڵە بوون ئەگەر هەقیقەتی پەیامو بیرو بۆ چونەکەی بناسێت ئەوا هەوڵو تێکۆشان بەکردەوەو موسەخەرکردنو ئاوەدانکاری چاك ئامانجی ئاینو زیکر بووە لە زەویدا. کەواتە خۆش بەختی بۆ ئەو باوەڕدارە ماندوو نەناسانەی کردەوەی جوان دەکەنو هونەرو وردەکاری بەکار ئەهێننو جیهاد دەکەن لە گەڕان بەشوێن ڕزقو ڕۆزیو زانست هەروەها ئەو دەرسو توێژینەوانەی کەسودی خەڵکی تێدایەو پێویستیەکانیان پڕئەکاتەوە ژیانیان بۆ ئاسان دەکاتو کۆمەڵگایەکی بەپیتو داد پەروەر لەناو خۆیاندا دروست دەکەن کۆمەڵگایەکی بۆ یەك خەمخۆرو بەزەییو ئاشتیو ئاسایش کە لە پیلانی دوژمنو دەست درێژی دوژمنەکانیان ئەیانپارێزێت. لەم کاتەدا بەیدەبا وتی: شتێکە گرنگ هات بەخەیاڵمدا نەمویست لێی بیدەنگ بم بە پێویستم زانی پرسیاری دەربارەی بکەمو داوای ڕوونکردنەوەی لێ بکەم پێم ووت: گەورەم مامۆستا ئایا ئەوەی فەرموت مانای وایە ئەو هەموو ڕەنجو ئاوەدانیو شارستانییەی کە مرۆڤو ژیرییەکەی دای ئەهێنێ لەم زەوییەدا دەفەوتێتو نامێنێت بەنەمانی زەوی؟ گومان نابەم ئەو شتانەی کە باستکرد مەبەستت ئەوە بوبێت. مامۆستائیبن بەتوتە وتی: بەڵێ ڕاستە ئەی بەیدەبا ماناو مەبەستم ئەوە نەبوو تۆ ئەزانیت کە مرۆڤو ژیری مرۆڤ لە دەستکردی خوایە وە زەویو تواناو ووزەکانی کە خوای گەورە هێناویەتە ژێر باری مرۆڤ دیسان لە دروستکراوی خوایە، هەرچی پرۆژەی ئادەمیزاد هەیە لە ئەنجامدا هەر لە دروستکردنی خواو بەڕێوە بردنە کانێتی کەواتە چۆن گومان ئەبەیت، یان دێت بەخەیاڵتدا ئەو پرۆژەو هەوڵو ڕەنجانە هەروا بەبابچێت ئەی بەیدەبا ئەوەی مرۆڤ پێی هەڵئەستێ لە نوێ سازیو داهێنانی چاكو خێر هەروا بەفیڕۆناچێت گرنگە خۆتو برادەرەکانت بزانن، بەڵکو

زور گرنگە هەمومان تێ بگەین لەدوای هەموو ئەمانەو ئاکارەکەی ئەوەی کە ژیری مرۆڤ دای ئەهێنێت لە شارستانیو تەکنیك، نوێ سازی، ئاسانکاری، هێنانە ژێرباری ژینگە بەخۆڕایی ناچێتو نافەوتێ، بەڵکو ئەگوێزرێتەوە بۆ جیهانی رۆحو نەمری بۆ ئەوەی بەرهەمی کردەوە چاکەکەیان ببیننەوە کەلای خوای گەورە بەهرەمەندو بەختەوەر ئەبن پێیو پارێزراو ئەبن لە هەر زیانو خراپەیەك. کەواتە ژیانی دنیا ئاکامی پرۆژەی شارستانیو داهێنانی مرۆڤایەتی نییە لە سەر زەویدا، بەڵکو سەرەتایەکەو درێژەی هەیە بێگومان بەرەو جیهانی نورو رۆحو نەمری لەبەر ئەوە هەرچییەك ئادەمیزاد ئەنجامی ئەدا لە هەوڵو، کار، تەکنیك، تەنیا چێژو پشوی بۆ ژیان نیە، بەڵکو بەردەوام دەبێت بۆ جیهانی نەمریو هەمیشەیی ئەگەر چی مسقاڵە گەردیلەیەکیش بێت ئەچێتەناو دورترینو فراوانترین لەززەتو رابواردنو خۆشی. ئەی بەیدەبا پێویستە لەسەر مرۆڤی ژیر کارامەیی خۆی بەکار بهێنێت لەبیناکردنو داهێنانو ئاوەدانی کە خێرو فەڕی دونیاو رۆژی دوایی تێدایە **(فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ * وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ) (الزلزلة : ٧–٨)** کەواتە با ماندوونەناسان لە پێناوی ئەوەدا دەست بەکاربن. ئەی بەیدەبا کۆتایی جیهانی مرۆڤو شارستانیەکەی دوای تەواو بوونی پرۆژەکانی واتای فەوتانو نەمانی یکجاری نییە، بەڵکو میراتە، چونکە خوای گەورە میراتگری زەوییەو ئەوەی کە لە سەریەتی لە جیهانی خاكو نەمان بەرەو جیهانی نورو گیانو نەمری وە ئەم میراتەش ئەی بەیدەبا دروستکراوێکی بەرێزەو میراتێکی بەرزو بە نرخە. ئەی بەیدەبا چەند ناخۆشە زۆربەی ئادەمیزاد ژیانیان بەکەم تەرخەمیو تەمبەڵیو گاڵتەجاڕی بەفیرۆ دەدەن، یان ژیانیان لە پێناوی شەڕو خراپەکاریو گەندەڵی ئەبەنە سەر هەلی هەموو تەمەنیان لە دەست دەدەن لە دوای ئەوەی هەموو شتێك بەسەر چوو پەشیمان ئەبنەوەو کاتی پەشیمانیش دێت. ئافەرین بەیدەبا ئەو پرسیارە گرنگەت کرد بۆ ئەوەی بۆ خوشكو برایانی ئامادەبوو رۆشن بێتەوە لە دوای ئەوانیش کەسانی تریش بە ئیزنی خوا. بەیدەبا وتی: بەڵێ ماموستای گەورە بە راستی روونت کردەوە خوا پاداشتت بداتەوە لە باتی ئێمەو لە باتی پاشەڕۆژی نەوەی گەلە سەرکەوتووە نوێ خوازە ماندوو نەناسەکان ئەوانەی کە لەپاشی ئێمەوە دێن بەیدەبای دانا ئەڵێیێت :پێم باشە کەمن نزیك ئەبمەوە لەکۆتایی گێڕانەوەی ئەم چیرۆکەو سەرگوزەشتەکانی خوێنەر

بەو شتانە ئاگادار بکەم کە لە وتەکانی مامۆشتای گەرۆك ئیبن بەتوتەوە ئەبیست لەچاوپێکەوتنەکانی پێشوماندا. ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تێ بگات سەرچاوەی ئەو کردەوەو بڕیارانەی کەپلەو پایەی ئەم ئومەتە دیاری ئەکات هەروەها پایەی وڵاتو هاوڵاتی ئایا سەربەرزو بەڕیزە، یان زەبوونە؟ گەورەیە، یان کۆیلەیە؟ بەتوانایە، یان دەستەوسانە؟ بەتاڵە، یان ئیش کەرە رۆشن بیرە، یان نەفامە؟داهێنەرە، یان تەنها لاسای کەرەوەیە؟ پلەو پایەی هەموو ئەمانە لەجیهانی نەتەوە شارستانیەکاندا چییە؟

ئەوەی ئەم بڕیارە دەرئەکاتو ئامانجو رووی دیاری ئەکات هۆشیاری هەر باوکێكو تێکوشانێتی لەگەڵ چاودێری هەر دایکێكو سۆزێتی. هەروەها چۆن پەروەردەی رۆڵەکانیان ئەکەن؟ وەلە جۆری کام هاو وڵاتی دەرئەچن؟ هەروەکو پێشینان ووتویانە:(لەسەر هەر چییەك راهاتی هەربەوەش سەر سپی ئەکەیت) خوای گەورەش فەرمویەتی (**إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ**) (**الرعد : ١١** ) شێخ ئیبن بەتوتە لەم بارەیەوە دەڵێت : ئەی بەیدەبا زانستو زانیاریو روانگەی ژیری بەس نییە بۆ جوڵاندنی خەڵکی ئەگەر ئەو ژیریو زانستە گونجاو نەبێت لەگەڵ سروشتو ناخیاندا بە پێچەوانەشەوە ئەبێتە تەنیا ووتەیەکی بێ کردار، یان قسەیەکی بێ نرخ کە ناگاتە نرخی ئەو مرەکەبەی کەنوسیوێتی لەبەر ئەوە ئەبینی قسەکەر راستی دەزانێت کەچی بەدەمیەوە ناچێت، هەڵە دەزانێت کەچی سورە لەسەر کردنی، لەبەر ئەوەی کە تەبیعەتو ناخی لەگەڵ داوا کارییەکانی ئەوزانستو زانیاریو ژیرییە ناگونجێت. لێرەوە ئەی بەیدەبا گرنگی پەروەردەو دروستکردنی ویژدان لەژیانی تاكو گەلدا دەردەکەوێت :، چونکە بناغەی خواستو کردارە لە بوونو قەوارەی مرۆڤدا هەروەها ئامرازێکە بۆخستنە گەڕی ژیریو زانست لەژیانیدا.کەواتە پێویستە لەسەر باوکانو دایکان بخوێننو فێرببنو بگەڕێن بەشوێن ئەوەی کەچۆن رۆڵەکانیان پەروەردەبکەن و ئەوەی کە لەکاتی خۆیاندا لەکیسیان چووە ئەوان بەخت بخەنە سەری، چونکە لەجیهاندا ئەوەندەی باوكو دایك کاری گەرییان هەیە لەسەر پێکهێنانی ئیرادەو ناخی منداڵەکانیان هیچ هێزێکی تر بەو وێنەیە کاری گەری نییە. هەروەها قوتابخانەش کە بە پلەی یەکەم دێت بۆ فێربوون. و رۆڵی لە پەروەردەو پێگەیاندن شان بە شانی دایكو باوك رۆڵی یارمەتیدەر دەبینێت لەو بوارە ناسکەدا بەڵام تێکڕا ناتوانێت بەتەواوی ببێت بە دیل مەگەر لە کاتێکدا باوان ویستیان پەروەردەی خراپی رۆڵەکانیان بکەنو ویژدانیان تێکەڵو پێکەڵ بکەنو وازیان لێ بهێنن بۆ ژێر کارتێکردنی هەر کەسێك لە هاوەڵو رەفیق، یان کاریگەری بەرنامەو

کەناڵە ئاسمانیەکان بەسەر یانەوەو دوور لە چاودێری. بەیدەبای داناو ژیر دواین ئامۆژگاری زیاد دەکات بۆ ئەو کەسە ئەم چیرۆکە ئەخوێنێتەوەو خامەکەی لە سەر داناوە، ئەو ئامۆژگاریەش کە نابێت نادیار بێت لە بیری خوێنەرو بیری هەموو هاولاتیەك لە هەر کۆمەڵگایەکدا ئەویش گرنگی دامەزراوە کۆمەڵایەتیە میللییەکانن کە شەشن و هەڵبژێراون و سەر بەخۆ کە خۆشگوزەرانی و ئاشتی و ئاسایشی بەخشیوە بە خەڵکی دۆڵ و دورگە وەهەمیشە سەرچاوەی هۆشیاری و جێگای بایەخیان بووەو سوربوون لە سەر هەوڵی دروستکردنی ئەو دامەزراوانە لە ناو نەتەوەو نیشتیمانیاندا ئەو دامەزراوە سەر بەخۆیانەش کە شەشن بریتین لە: دام و دەزگاکانی ئایین و خوو رەوشت و بنەما کە بریتییە لە ناخ و ویژدانی نەتەوە، بانگەوازی خێرو چاکە بلاو دەکاتەوەو پایەی ئاین و ڕەوشت بەرز ئەکاتەوەو هەوڵ دەدات لە پێناوی فێرکردن و بانگەواز بۆی. دام و دەزگاکانی راگەیاندنی ناو خۆیی کە هۆشیاری پەرە پێئەدات و هەواڵەکان بە راستی دەگەیەنێت و بڕیارەکان جێگیر دەکات. دەزگای ئەنجومەنی راوێژو یاسا دانان (**مؤسسة مجلس الشورى والتشريع**) کە لە قەناعەت و ناخی هاولاتیانەوە چەند یاسایەك دەر دەچێت کە رێڕەوی ئیش و کار دیاری دەکات لەگەڵ دامەزراندن و ڕێك خستنی پێوەرو بنەماکانی (**ضوابط**) لەگەڵ لایەن و بۆ چونی هاولاتیان بە رەچاوکردنی تەواوی رێزی مرۆڤایەتی و تایبەتمەندییەکانیان کە هەندێك لەو یاسایانە گشتین و هەندێکیان تایبەتین هەندێك لەوانە بەردەوامن و هەندێکی تریان بەپێی بارو دۆخ و کات تەواو دەبێت. دەزگای جێ بە جێ کردن کە نەخشەی کار دەکێشێت لەگەڵ رەچاو کردنی بەرژەوەندییەکان و چەسپاندنی ئەمن و ئاسایش و ئاشتی هەروەها فەراهەم کردنی پێداویستیەکان. دەزگای ئەنجومەنی داد(**هيئة القضاء**) کە دەوڵەتی یاسا رادەگرێت و مافەکان بەدی ئەهێنێت، یەکسانی و داد پەروەری ئەپارێزێت. دەزگای لیژنەی پاراستنی دەستورو پاراستنی دامەزراوە یاسا کۆمەڵایەتیەکان لە بەجێ هێنانی کارەکەیاندا کەبە پایەی پاسەوان و پارێزگار دێت و چاودێری ئیش و کارو دامەزراوەکانی تر دەکات و چۆنیەتی پابەند بوونیان بەکارەکانیانەوە. لەبەر ئەوە بەرهەڵستی دەست درێژی و سنور بەزاندن دەکات. ئەم دامەزراوانە بریتین لە دەسەلات و دەزگای سەر بەخۆ لە هەمان کاتدا هاوکارو یارمەتی دەری یەکترین، بەڵکو هەموو تەواوکەری یەکترین و یەك دەست کۆیان دەکاتەوە بۆ روو بە روو بوونەوەی پێویستیەکانی کۆمەڵگاو بەرز کردنەوەی هەق و داد پەروەری و یەکسانی و دەستەبەری هەروەها بەرهەڵستی لە زوڵم و زۆر داری دەکات و دژی خراپەکاری و

دیکتاتۆری دەوەستێ کەچەند نەخۆشینێکن زۆربەی وڵاتو کۆمەڵگاکان پێوەی گیرۆدەن.
شێخ ئیبن بەتوتە دەڵێت: بزانە ئەی بەیدەبا: لەگرنگترین هۆکارەکانی دۆڕاندنی زۆربەی گەلانی رابردوو هەرچەند بیرو باوەڕیان بەرز بوبێتو ئامانجیان گەورە لە کاتێکدا نەیانتوانیوە ئەم دامەزراوانە دروست بکەن کەبەبێ ئەوانە بیناکەیان لەرزۆكو ناجێگیر بووە. لەبەر ئەوە ئاسان بووە لاوانو چەواشە کردنی روانگەو بەرنامەی فیکری لەناویاندا وە ئاوەدانیو شارستانیەکەی بەرەو تیاچونو نەمان کۆتایی هاتووە

# ئادەمیزاد لە گا گەوجترە

بەیدەبا دەڵێت: بەڵێ پێویستە هەموو بزانین‌و هەر کەسێکیش ئەم چیرۆکە ئەخوێنێتەوە کە مامۆستای شکۆمەند ئیبن بەتوتە لە وتەو ئامۆژگارییەکانیدا راستی کردووەو پێکاویێتی کە پێویستە ئەم شەش دامەزراوانە هەبن بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی دادگەرو پێکەوە هاودەم‌و تەبا لەهەر نەتەوەیەکدا، بۆ سەر کەوتن بە سەر ستەم‌و خراپەکاری‌و دەست درێژی‌و داگیرکاری، هەروەها پێویستە سور بین لە سەر ئەوەی هەڵەی سەردەمە پێشوەکان دوبارە نەکەینەوە، کەم‌و کورِی نەکەین لە دروستکردنی دەزگاکانی فەرمان رِەوایی‌و بەرِێوە بردنی کۆمەڵگا، چونکە گرنگترین یارمەتی دەری جێگیر بوونی کۆمەڵگاکان بایەخدانە بە دروستکردنی ئەم دامەزراوانەو پاراستن‌و راگرتنیانە نەك تەنها لە پەیوەندیە ناوخۆییەکانی کۆمەڵگا، بەڵکو لە پەیوەندیە دەرەکیەکانیشدا وە بەردەوام کردنی لەسەر بناغەی بیرو بۆ چونی راستە قینەی ئوممەت، بەڵێ ـ وەکو ئیبن بەتوتە دەڵێت: گەلانێك هەن کە هزرو بیرو تێگەیشتنیان بۆ ماوەیە کە کۆکراوەتەوەو هەڵگیراوە. وە لە ناویاندا بەبەرز ترو گرانتر دائەنرێ لەغەیری خۆی بەلاَم لەبەر ئەوەی تەنیا نوسراوی سەر لاپەرِەبووە نەیانکردووە بەدەزگاو رێکخراوی کۆمەلاَیەتی‌و رامیاری‌و بکرێتە هێزێکی کاریگەری لێدەر بۆ رێرِەوی کۆمەڵگا ئەو بیرو رِاو کە لەپورانە سودێکی ئەو تۆی پێ نەگەیاندون، بە پێچەوانەی ئەو گەلانەی هەرچەندە فیکرو بیرو بۆ چونیان لە ئاستێکی نزم دایە بەلاَم توانیوێتی ئامانجەکانی بەدی بهێنێت لە دەسەلاَت‌و کارامەیی‌و چەسپاوی کۆمەڵگاکەی‌و رێکو پێکی لەگەڵ رەچاوکردنی خواست‌و ویستی جەماوەری گەلەکەی‌و بەرژەوەندی گشتی لەبەرِێوەبردنی کۆمەڵگاکەیاندا، چونکە گرنگییان داوە بەدامەزراوەکانیان و جێگای بایەخیان بووە. من بە چاوی خۆم دیومە (وەکو ئیبن بەتوتەش دیویەتی)ـ سەرسورِهێنەرە ئوممەتێك کە لە فیکری یەکێتیی مرۆڤەکان و پێکەوە بەندبوونیان‌و مافیان لە ئازادی‌و هەڵبژاردن دەردەچێت و هەڵئەقولێت، کەچی کۆتایی پێ دێت ئەویش بەهۆی پشت گوێ خستنی ئەو دەزگاو دامەزراوانە کە فیکرو بیرو بۆچوونەکان ئەخاتە گەرِو ئەیکاتە کارێکی واقیعی و هێزێکی کۆمەلاَیەتی بەکارو چالاك ئەمانە پشت گوێ ئەخات هەتا ئەبێتە ئوممەتەێك نمونەی پێ ئەهێنرێتەوە لەسەر هەژاری‌و نەفامی و ماف خوراو و گەندەڵ هەروەها لێك هەڵوەشاوو پارچە پارچە کراو کەهیچ وشەیەك، یان بەرژەوەندیەك کۆیان ناکاتەوە نەپەیوەندی‌سۆز

نەئایین پێکەوە بەندیان ناکات، بەڵام ئومەتانێکی تری گەورەی زلهێز هەن کە لە بیرۆکەو مەفهومی کێشەو بەرژەوەندی خۆیی هەڵدەقولێت هەروەها لە فیکری رەگەزپەرستی نەتەوەیی و جیاوازی مرۆڤەکان دەردەچێتو ناسنامەی مرۆڤایەتی لەسەر جیاوازی لەرەگەزو رەنگو زماندا بەندە کەچی لە یەکتایی گەلەکەیدا سەرکەوتووەو لەدروستکردنی دامەزراوە رێکخراوە جیهانیەکان کە هەندێك جار بە (**عصبة**) کۆمەڵەو جارێکی تر بە (متحدە) یەکگرتوو نەك بەمەبەستی بەدیهێنانی ئاشتیو دەستبەسەراگرتنی کێشەو جەنگو داگیرکارییەکان لە نێوان گەلاندا، بەڵکو بە نیازی دەستکەوتو زاڵبوون و خۆسەپاندن. لەبەر ئەوەی شەڕو داگیرکارییە نێودەوڵەتییەکان هەر ساختەی ئەم دەوڵەتانەیە و بە چەکێکیش کە لە داهێنانو بەرهەمی پیشەسازییەکانی خۆیانە کە ئەمڕۆ لە کاولکاریو ژمارەدا زۆرکۆکوژو لەناوبەرترن لە هەر سەدەیەکی تری رابردوو، چونکە ئامانجی سەرەکی ئەم دامو دەزگا نێو دەوڵەتیانە کەچەند گەلو وڵاتێك ئەیبەن بەڕێوە بریتییە لەبەدی هێنانی دەستکەوتی دەسەلاتی جیهانیو سەروەریو پاراستنی خۆیی و ئەندامەکانی لە چوونە ناو جەنگەوە، بەم دەزگاو دامەزراوانە توانیویانە تەواوی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەدەست بهێننو خۆیان بسەپێنن لەکاتێکدا وڵاتەکانی خۆیان ناکەن سوتەمەنی جەنگەکان، بەڵکو وڵاتانێك دەبنە سوتەمەنی لە نێوان هێرش بەرەکان و قوربانیانی کێشەو جەنگەکان بەمەش توانیویانە سامانێکی زۆری گەلو دەوڵەتە ژێردەستەکان بکێشێتەوە بەکەمترین ئەركو هەرزانترین نرخ بەڵام لەوانە بوو وشەی دادپەروەری و راوێژ کردن وەمانای ئاشتی و برایەتی سەربکەوتایە ئەگەر ئەو گەلە چەوساوانە لەسەرەتای دەرکەوتنو تواناییاندا دەستیان بکردایە بەدروستکردنی ئەم دامو دەزگایانەی کەئەو دروشیانە ئەخاتە کار و تەنیا بەبیرو فە لسەفە نەمێنێتەوە لەتوێی پەرتوكو ووتاری مینبەرەکان. بەیدەبا ئەڵێت: قسەکانی شێخ ئیبن بەتوتە لە بارەی گرنگی ئەم دامەزراوانەو گرنگی هاوکاریو کاری دەستە جەمعی لەگرنگترین دایشتنەکانو گرنگترین قسەکانی بوو بۆ ئێمە. بەیدەبا ئەگێڕێتەوە: رۆژێکی ساردو باراناوی بوو مامۆستا خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە بەپاڵ زانیاریو ئامۆژگاریەکانی رێزی لێنایین بەخۆشەویستیو پێشوازییە جوانەکەی خۆش رەفتارو دەم بەپێکەنینی برێك دۆشاوی خورماو شیرو نۆشیدەنی گەرمی بۆهێنایین کەگەرمی بەخشی بەدڵمان پاشان بەدڵێكو گوێیەکی کراوەوە رومان کردە مامۆستا بۆبیستنی قسەکانی.

مامۆستا دەستی کرد بەقسەو وتی: ئەی بەیدەبا دروستکردنی ئەم دامەزراوانە گرانتیی‌یە بۆ کارامەیی‌و چەسپاوی‌و بەردەوامی ئەوگەلانە وەسەرۆکایەتی‌و فەرمان رەوایی هەردەوڵەتێك پشت هەڵبکات لەدروستکردنیان بابزانین پاڵنەرەکەی تەنیا خراپە کاری‌و بەرژەوەندی تایبەتییە وەپاشەڕۆژی گەل‌و وڵاتەکەی لاوازی‌و لێك دابڕان و تیاچوونە. ئەم دامەزراوانە لەم سەردەمەدا شتێك نییە بەئارەزو بکرێت، بەڵکو لەخۆیدا بووەتە بناغەیەکی سەرەکی لەم قۆناغەی شارستانی‌و ئاوەدانی کەپێشکەوتن‌و سەرکەوتنی هەرگەل‌و دەوڵەتێك نییە بەبێ ئەوە. ئەی بەیدەبا مرۆڤایەتی بە هۆزو کۆمەڵی جیا جیاو دوور لە یەك نەماوەتەوە وە تواناو قارەمانی‌و پاڵەوانێتی وەکو مەسەلەیەکی تاکە کەسی‌و عەنتەری سادەیی نەماوە، بەڵکو مرۆڤایەتی‌و زانست‌و تەکنۆلۆجیاو بەرهەمەکانی بووە بە جیهانێکی فراوانی ئاڵۆزو چون یەك لە قەوارەو پەیوەندی‌و بەرژەوەندییەکان هەروەها ژیانی مرۆڤو بیرو بەرهەموو ئاوەدانی‌و ئەو قۆناغەی کە زانست پێی گەیشتوە بریتیە لە چەندەها شتی ئاوێتەو ئاڵۆز کەناتوانرێ زاڵ بیت بەسەریدا یات ئەو قۆناغە لەگەڵیان ببڕییت لە بەر ئەوە پێویستە شان بە شان‌و هاوکاری یەك بەپێی جیاوازی پسپۆڕیان لە کۆمەڵی کارو دەزگاکانی بەرهەم هێنان هەرچەندە جیاوازیان هەبێت لەتواناو جۆری کاردا. ئەم سەردەمە بریتییە لە سەردەمی دەزگایانی زانستی‌و بەرهەم هێنان، بازرگانی بە وێنەی دوکانێك لە گەڕەکێکدا، یان باری وشترێك لەلادێ یەکدا نەماوە، بەڵکو بووە بە کۆمپانیاو دەزگای گەورە گەورە کەتواناکانی زیاتر لە وڵاتێك ئەگرێتەوە، بەڵکو زۆر جار کیشوەرەکانیش ئەبڕێت هەروەها بەیدەبا زانست‌و زانیاری ـ بەو تەوژمە زانستی‌و قوڵاییەی کە هەیە ـ بە شێوەی بیرۆکەی چەند کەسانێك لە نێوان بەرگی کتێبەکادا، یان لە پەرستگاکاندا نەماوە، بەڵکو بریتییە لە دەزگای گەورەی زانستی‌و کارگەی توێژینەوەی زانستی لێدەرانە کە هەزاران پسپۆڕ رۆڵیان هەیە تیایداو چەندەها ئەستێرەی بلیمەت‌و داهێنەر تیا ئەدرەو شێتەوە کە هاوکاری دەکەن بۆ پێکهێنانێکی زانستی لە داهێنان‌و نوێ سازی‌و دروستکردنی ئەو ئامێرانەی کە زەوی پڕ ئەکەنەوە و بنکی دەریاکان ئەبڕێت‌و ئەگاتە هەورەکان. تۆش ئەبینیت‌و ئەزانیت داهێنان‌و بەرهەم هێنان گەشتۆتە کوێ کە بۆ شایی‌و پێویستیەکانی ملیۆنهاو بلیۆنها پڕ ئەکاتەوە ئەویش بەبڕینی ڕازاو نهێنییەکانی سروشت لە گۆڕینی داهاتەکان بۆ ووزەی پیشە سازی بەهێزو دروستکردنی جۆرەها ئامێر هەتا یەك پیشە سازی لەوانە هەزاران کرێکاری گرتۆتە ئەستۆو هەروەها دامەزراوەکانی وەك پەلی هەشت پێ پەلیان کێشاوە بە سەر وڵاتانی

جیهانداو سەدان هەزار کارمەندی هەیە. ئەی بەیدەبا ـ خۆتو برا دەرانت ـ گەنجانی ئەم نەتەوە دواکەوتووەو سەر کردەکانی ئاگادار بکەنەوە ڕابکەن بەو سەردەمەی کە تیا ئەژین، ئەو قۆناغە شارستانییەی کە مرۆڤایەتی پێی گەشتووە بە هەموو توانایەکیانەوە بچنە ناو سەردەمی دامەزراوەکان، داهێنانەکان یەکێتی. هاوکاری لە هەموو بوارەکانی ژیاندا. هەروەها نەتەوەو وڵاتانو تاکە کەسانیش لە ناو کاری کۆمەڵو هاوکاری کۆمەڵدا دەر دەکەونو جێگە دەستیان دیارە، چونکە بریتییە لە بەر پرسیارێتی بەرامبەر پەیمان بەستنو مرۆڤایەتی، ئاوەدانی، هاوکاری کۆمەڵ ئەوەش ڕێگایەکە بۆئەوەی گەلە مردووەکانو ژیانیان زیندوو بکرێتەوە بەرەو دروشمو ئامانجە بەرزەکانیان بڕۆن کە لە باوانیانەوە بۆیان ماوەتەوە. بەیدەبا وتی: بەڵێ مامۆستای پایەبەرز پێویستە لەسەر ئەو گەنجانە لەسەر ئەو میللەتانە پەی بەرن بە گرنگی هاوکاری دەزگاکانو گیانی کۆمەڵ لە ڕێخستنی ژیانیانداوە بیرۆکەی تاکە کەسیو سەرەتاییو سادەیی لە خۆیان هەڵکەنن کە لەسەر خەوو خەیاڵی پاڵەوانە نەبەردەکانو عەنتەریان بەندە بۆ ڕزگارکردنی هەژارانو چەوساوەو بێ نەوایان، چونکە ئەم بارو دۆخەی ئێستاو ئەم سەردەمە سەردەمی جاران نیە وە لەبەر ئەوەی تیرو شمشێرو ئەسپو شەوو بیابان جێگایەکی نەماوە ژیانو شارستانیو ئاوەدانی مرۆڤ لە جیهانی ئەمڕۆدا بووەتە بەرهەمی زانستو زانیاریو هاوکاری دامو دەزگاو یاساو نیزام کە بەبێ ئەوانە تواناو پەرەسەندنو پێشکەوتنو بەرهەم نابێت، ئەوەی ئەم کارانە پشت گوێ بخاتو منداڵەکانی لەسەر هەرسکردنی واتاو مەبەستەکانیو بەجێ هێنانی پەروەردە نەکات ئەوا لە جیهانی هێزو دەسەڵاتو ژیاریدا شوێنی نییە هەروەها لە پێش بڕکێی نەتەوەکاندا جێگایەکی نییە.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: بەڵێ ئەی بەیدەبا: پیرو گەنجو منداڵ فێر بکە لە هەر وڵاتێکدا کە سەرکەوتن و شکۆییو دەسەڵاتداری لە گەشەپێدانی هاریکاریو گەشەپێدانی گیانی کۆمەڵو دروستکردنی دامودەزگاکانە لەهەموو بوارەکانی فیکریو توێژینەوەی زانستیو کارو وەبەرهێنانی وەفێریان بکە ئەمانە کلیلی هێزو تواناو دەسەڵاتو شارستانیو ئاوەدانییە لەجیهانی ئەمڕۆو بەیانی. پاڵەوانانی ئەم سەردەمەو سەردەمی داهاتوش خاوەنی گڕوتینی عەنتەری نین، بەڵکو زاناو بیرمەندو لێکۆڵەرەوەنو ئەوانەی شەوو ڕۆژ خەریکن بەبێ ماندوبوون لەکارگەو پیشەسازیو کانەکانو زانکۆو هۆڵەکانی وانەو توێژینەوەو کونو کە لەبەری دارستانەکانو بیابانو لوتکەی شاخەکان هەروەها ناو دەریاو هەورەکانی ئاسمان

کەکۆشکی توانستو زانست و زانیاری دروست دەکەن چین لەسەر چین بەرەو ئاسۆیەکی گەورەترو فراوانتر لە نهێنیەکانی بوونەوەرو وزەو تواناکانی.

بەیدەبا وتی: مامۆستای بەڕێز ڕێگام پێ ئەدەیت تۆلەدانیشتنی ڕابردوودا باسی چیرۆکی کە لەشێرەکەت بۆگێڕاینەوە ئێستا ڕێگام ئەدەیت بەسەرهاتی ژیانی ئاژەڵێکت بۆ باس بکەم کەبەچاوی خۆم دیومەو لیێی کۆڵیومەتەوە. تۆئەزانیت چەند مەیلو ئارەزووم هەیە بەژیانی گیان لەبەرانەوە و ئەوەی کە لەوانەیە مرۆڤ بتوانێت پەندو ئەزموونی لێ وەرگرێت چیرۆکێکە پەیوەندی هەیە بەگرنگی گیانی کۆمەڵو کاری دەستەجەمعی ئەویش نموونەی چەند سەگێکی دڕندە هەرچەندە لاشەیان ووردو بێ هێزە ئەتوانن گایەکی وەحشی بدەن بەعەرزداو بیخۆن کەچەند زلو بەهێزو شاخەکانی تیژو درێژ وەك تیرو شمشێری تیژ بڕ.

شێخ دەمو چاوی کرایەوە و وتی. ئەی بەیدەبا بەخێربێیتەوە چیت پێیە لەو بارانەوە ئەوا گوێی من و هەموو ئامادەبووان کراوەیە. سەیرە ئەوسەگانە بتوانن گایەکی کێوی بخۆن لەکاتێکدا چاوەڕوان دەکرێت مردار ببنەوە لەبەردەمیا پێش ئەوەی گا کێویەکە چاو بنێ بەیەکدا. بەیدەبا وتی: ڕاست ئەکەیت مامۆستا بەراوورد نییە لە نێوان توانای گای کێویو سەگ بەلاَم پەندو عیبرەت ئەوەیە لێرەدا بەهای هاوکاریو یارمەتیدان و کاری کۆمەڵ کەئاماژەت پێکرد لەوانەکانتدا دەربارەی دامو دەزگاکان و کاری دەستە جەمعی لە جیهانی ئەمرۆدا.

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: زیاتر تامەزرۆت کردین بۆ قسەکانت پێمان بڵێ ئەی بەیدەبا. بەیدەبا وتی: ئەم چیرۆکە، بەڵکو ئەم ڕووداوە ڕاستەقینە شوێنەکەی لەڕۆژ هەلاَتی ئەفریقیایە بەشێوەیەك ئەم گاکێویانە بەکۆمەڵێکی زۆرو فراوان ئەژین کە هەزارانی لەم ئاژەڵە ئەستورە جوانەی تێدایە هەروەها ئەم ئاژەلاَنە کۆچی سالاَنەیان هەیە کەهەزاران میل دەبڕن بەشوێن شیناییو ئاوو لەوەڕگا بەلاَم ئەوەی گرنگە بەلامەوە باسی بکەم کە لەم ئاژەڵەوە دیومە دوو شتی سەیرە لەئەسڵو سروشتی ئەم ئاژەلاَنە.

مامۆستا وتی: پێمان نانا سێنیت ئەی بەیدەبا : خاسیەتی یەکەم چییە؟ بەیدەبا وتی: خاسیەتی یەکەم ئەوەیە ئەو ڕانە هەزاری تەواویان لەیەك هەفتەدا لەدایك ئەبن مامۆستا وتی: بەلاَم بۆچی هەموو لەیەك هەفتەدا لەدایك ئەبن؟ بەیدەبا وتی: ئەگەر وانەبوایەو هەموویان لەیەك هەفتەدا نەزانایە ئەوا وەچەی ئەم گیانلەبەرە دەفەوتاو بەرەو نەمان ئەچوون.

مامۆستا وتی: بەڵام ئەمە چۆن رووئەدات ئەی بەیدەبا؟ بەیدەبا وتی: ئەم رانە زۆرو گەورەیە لەگا کێوی. سەگی وەحشی شوێنیان ئەکەون کەبەچکەی گاکێویەکان ئەخۆن ئەگەر ئەم گیانلەبەرانە بەین بەینو ماوەی دوور لەیەك بەچکەیان بووایە ئەوە سەگە وەحشییەکان دەستیان ئەگرت بەسەر هەموو بەچکە کانیاندا یەك بەیەکی بەڵام بەم شێوەیە بەشێکی گەورەیان لەبەچکەکان ئەمێننەوە و گەورە ئەبن بۆگایەکی تەواو کەسەگەکان ناتوانن پەلاماریان بدەن.

شێخی گەڕۆك وتی: ئەوەی تۆباسی ئەکەیت سەیرە : بەڵام یەکەم جار ئەوسەگانە چۆن ئەتوانن پەلاماری بەچکەکان بدەن ئەی دایکیان لەکوێیە. ئایا ئاگایان لەبەچکەی خۆیان نییە تا بیان پارێزن کەئەوە لەئەسڵی سروشتی دایکایەتی دایە. خەریکە نەچێتە ئەقڵەوە ئەی بەیدەبا بەیدەبا وتی: لەسەر خۆبە مامۆستا ئەوەی تۆدەیڵێیت دروستە، چونکە دایکی ئەم بەچکانە هەوڵ ئەدەن بەرگری بکەن لە ووردیلەکانیان بەڵام گەلجۆییو بیٚ مێشکیان هەرچەندە بەهێزو زلن هۆیەکن بۆ لەناوچوونی بەچکەکانیان هەروەك فێڵبازی سەگە دڕندەکانو گیانی کۆمەڵو هاوکاریان کەباست بۆمان کرد هۆیەکە بۆزاڵ بوون بەسەر گاکێوییەکەو راکێشانی بەچکەکەی لەبن دەستیدا. شێخ وتی: توخوا بە پەلە پێمان بڵێ، چۆن ئەوە روو ئەدات؟

بەیدەبا وتی: نهێنیەکەی لەوەدایە سەگەکان بەتەنیا لەمانگای دایك نزیك نابنەوە، چونکە ئەگەر بەتەنیا بوو ناتوانێ بگاتە بەچکە و دایکەکەی هەر بەشاخەکانی خۆی لەناوی ئەبات.

شێخ وتی: ئیتر چۆن لێیان نزیك ئەبنەوە؟ بەیدەبا وتی: ئەو سەگە وەحشیانەی ئەیانەوێ بەچکەیەکی دیاری کراو بخۆن بریتین لە سیان یەکەمیان بەرەو بەچکە ئەڕوات دایکەکە بەهەموو هێزو توندو تیژییەکەوە شاخەکانی قنج دەکاتەوە سەگەکە راو ئەنێت بەرەو هەر لایەك بەشوێنیدا ئەچێت. ئەمجارە لەملاوە سەگێکی تر پەلاماری بەچکەی ئەدات دیسان دایکەکە سەگەکەی تر جێدەهێڵێ دێتەوە بۆئەوی تریانو ڕاوی ئەنێت پاشان سەگی سێهەم دێتەوە بۆبەچکەکە و پەلامار دانیو مانگای دایك بەهەمان شێوە ئەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی بەم جۆرە دایکەکە تەواو ماندوو دەکەن لە نێوان راو نانو گەڕانەوەدا هەتا تەواو وای لیٚ دێت ناتوانێت پەلامار بداتو لەسەر بەچکەی بکاتەوە سەگە دڕندەکانیش بەرئەبنە گیانی

بەچكەو بەم لاولادا ئەیكێشنو ئەیكەنە نێچیرێكی ئاسانو بەتام بەبەر چاوی دایكیەوە كە هیچ رەدو بەرگرییەكی پێ نەماوە.

بەیدەبا وتی: گەورەم تێگەشتی چۆن تەواو دەبێت؟ وە چۆن ئەو سەگانە زاڵ ئەبن بەسەر گای كێوی هەرچەند هێزو زەبری هەیە هەروەها شاخی تیژ وەكو تیرو شمشێر شێخی گەرۆك وتی: ئەی گاكانی تر لە كوێن؟ئەی بۆچی گەلەكۆمە ناكەن بۆ فریاكەوتنیان؟ ئایا ئەمانە دوور كەوتونەتەوە لە رانەكە بۆیە توشی پەلاماری سەگەكان بوون؟ بەیدەبا وتی: نەخێر گەورەم هەموو لە ناو یەك راندا ئەڕۆن بە رێوە ئەو دایكەی كە سەگە دڕندەكان پەلاماری خۆیی بەچكەكەی ئەدەن دوور لە ران نین، بەڵكو بەبەرچاویانەوە سەیری ئەو شەڕە ئەكەن لە نێوان مانگای دایكو بەچكەی لەگەڵ سەگە وەحشییەكاندا بەو چاوە جوانەیان سەیریان ئەكەن بێ ئەوەی هیچیان چاو بنێن بەیەكداو لە شوێنی خۆیان تەكان بدەن خۆ ئەگەر گایەك، یان مانگایەك یارمەتی ئەو دایكە داماوەی بدایە سەگەكان نەیان ئەتوانی لە بەچكەكەی نزیك ببنەوە، یان راوی بكەن. ئەمە پەندو دەرسێكە لەبەر ئەوە گا كێوییەكان بەنەفامیو گێلێتی خۆیان هاوكاری یەكیان نەكردو هەریەك لەوانە روو بە رووی ئەو چارەنوسە دەبێتەوە بەتەنیایی، كەس ئاگای لەوی تر نییە هەتا سەرەی خۆشی دێتو ئەبێتە یەكێك لەنێچیرەكانو ئەوكاتەی ئەكەوێتە دەستی دوژمنەكانی تیكەیەكی خۆشو ئاسانە كە هیچ پاڵپشتو یارمەتیدەرێكی نییە لەگەڵیدا روو بەڕووی بەڵاو سەختیەكانی بێتەوە، ئەوكاتە پەشیمان ئەبێتەوە كە هیچ سودێكی نییە. ئەم پەندو ئامۆژگارییە كە گەورەم، روونی ئەكاتەوە چۆن هەتا ترسنۆكێكی لاواز زاڵ ئەبێت بەسەر ئەوەی كە لە خۆی بەتواناو بە هێز ترە، چونكە مانای هاوكاریو گیانی بە كۆمەڵو یارمەتی ناسیوە. وەچۆن بەتوانایەكی وەكو گای كێوی بەهێزو زەبەلاح ئەی دۆڕێنێ لەبەردەم گیاندارێك كە زۆر لە خۆی لاوازترە تەنانەت كەڵكی لەشاخەكانی خۆیشی وەرنەگرت، چونكە مانای هاوكاریو ئیشی بەكۆمەڵی نەزانی شێخ ئیبن بەتوتە وتی: ئێستا لەناوەڕۆكی باسەكەت گەیشتم ئەی بەیدەبا كە چۆن دەسەڵاتو هێز دەگۆڕێت بۆ بێ هێزیو لاوازیش دەگۆڕێت بۆ هێزو توانا ئەگەر مانای هاوكاریو مانای داموو دەزگاكانو مانای گیانی بەكۆمەڵمان زانی. بەیدەبا وتی: من لەوە تێدەگەم مامۆستا گیان كە گیاندارێكی وەك گای كێوی بكەوێتە ناو نەفامیو داماوییەكی بەم جۆرە، بەڵام لەوە تێناگەم چۆن نەتەوە گەلێكی بەرەی ئادەمیزاد دەكەونە ناو ئەم هەڵوێستە بێ مێشكانەوە جیا جیا لەیەك، بەڵكو دوژمن دەهێنێتە سەر

خۆی: یەك لەدوای یەك دەبنە نێچیرێکی دەستی دوژمنیان هەرواش ئەمێننەوە نەوە لە دوای نەوە سەدە لە دوای سەدە لەنەفامیو سادەییو بێ ئاگاییدا دەژین هەتا هەموویان ئەگرێتەوەو توشی هەمان چارەنووس لە زەبوونیو رسواییو تیاچون دەبن. شێخ **ئیبن بەتوتە** وتی: بەڵێ ئەی بەیدەبا خراپەکاری چاو چنۆکی. بەرژەوەندی تایبەتیو دەسەڵاتێك کە لە لەکەدارکردنی بیرو بۆچوونو بەرنامەی فیکریو گەندەڵیو خراپی پەروەردە پەیدا بوبێت چاوو دڵەکان کوێر دەکاتو وائەکات لە ئادەمیزاد لەو گایە ساویلکە تربێت. ئەی بەیدەبا تۆ راستت پێکاوە لەکتێبە بەناو بانگەکەتدا (کلیلەو دمنە) رستەیەکت بەپەندو نمونە هێناوەتەوە(ئەو رۆژە خورام کە گاسپییەکەی تیا خورا). لەم کاتەدائیبن بەتوتە چاوی ئەگێڕا بەدەورو بەریدا هەرچەندە ماندوو بوونو دانیشتنەکە درێژخایەن بوو بەڵام ئەوان هێشتا هەر ئامادەو گوێ بیست بوون. مامۆستا پێی ووتن: ئەمڕۆ ئەوەی کە زانیمان بەسمانە بەئیزنی خوا لەدانیشتنی بەیانیدا تەوای ئەکەین.

بەیدەبا وتی: پێش ئەوەی بگەڕێمەوە داوام لە مامۆستا کرد ئەگەر شتێکی گرنگ هەیە پێمان بڵێ پێش ئەوەی بەجێمان بهێڵێتو ملی رێگا بگرێتە بەر لەزەوییە بەرینەکەی خوادا.

مامۆستای پایە بەرز وتی: بەڵێ دوو شتی گرنگ هەیە ئەمەوێ جەخت بخەمە سەریان، ئەی فەیلەسوفی دانا بەیانی ئەگەڕێمەوە سەریو بیری خۆتو برادەرەکانت دەخەمەوە تکام وایە بەو دوو خاڵەش کۆتایی بە قسەکانم بهێنم پیش جیا بونەوەو گەشتەکەم بەرەو سەر زەمینی ئەهلو خۆشەویستان.

# ئەو بەرخە ساویلکەی داوای گژوگیا لە قەساب دەکات

بۆ بەیانی پاش ئەو رۆژە بەیدەبای داناو برادەرەکانی رۆشتن بۆ لای پیری گەڕۆكو دەورەیاندا. بەیدەبا زوو دەستی کرد بەپرسیارو وتی: مامۆستای پایەبەرز دوێنێ پەیمانت پێ داین لە بارەی دوو خاڵەوە قسەمان بۆ بکەیت ئەو خاڵانە چین؟

شێخ ئیبن بەتوتە وتی: زۆر بەخۆشیەوە، یەکەمیان ئەی بەیدەبای پەندیار روونکردنەوەیە کە پەیوەندی هەیە بەتێگەشتنی مانای بیرو بۆچوونو روانگەی گشتی بوونەوەر هەروەها مانای بوونو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەویدا، چونکە رۆشن کردنەوەی ئەمانە سامناکترین شتە کە رووبەڕووی ئومەتەکان ئەبنەوە پێویستە بە هەموو رێگاکان روون بکرێنەوە، کلیلی ئەمەش ئەی بەیدەبا ناسینی نەتەوەو رۆشنبیریو ژیارەکانە کە لەسەر دوو جۆرن پێویستە بیانزانینو لە یەکیان جیا بکەینەوە بۆ ئەوەی سەر بکەوینو مەبەستی ژیانمان بهێنینەدی جۆری یەکەم لە شارستانیو رۆشنبیرییەکان. بریتییە لە جۆرێکی گشتی رۆحی نورانی، کە سەیری بوونی خۆی دەکات بە تێڕوانینێکی گشتیانە لە دەست پێکردنیەوە هەتا کۆتایی بەمەش تێ ئەگات لەبوونیدا ماناو مەبەستێك هەیەو ئەبیات بەرەو بنیات نەرێکی ئاوەدانی بە پیتو فەڕکە پابەند بێت بە دادپەروەریو بەزەییو ئاشتیو دەستەبەریو دور بکەوێتەوە لە زوڵمو ستەمو خراپەکاری جۆری دووەمیان لە ژیارو رۆشنبیرییەکان بریتییە لە بوونێکی ماددی جەستەیی ئاژەڵیانە کەنەباوە ڕوونەدەرکی نییە تەنیا بەتەنگ هەستو ئارەزوو رابواردنەکانێتی بەشێوەیەکی راستەقینە لە ماناو مەبەستی ژیان ناگات و جۆرێکە لەو گیانلەبەرانەی کە تەنیا یاسای دارستانو پەلاماردانو راوکردنو ستەم دەزانێت، کەپێی دەڵێن سیاسەتی رۆژ(**سياسة الامر الواقع**) و بەرژەوەندی نەتەوەیی. ئەم بەرامبەرکێیە تەمسیلی دوو شت ئەکات لە ژیانی خەڵکیو نەتەوەو شارستانیەکاندا، ئەویش بریتییە لە رۆحو خاك هەروەها تەمسیلی خێرو شەڕ، راستو ناڕاست، داد پەروەریو زۆر داری کە لە ئاکامدا هەر تەمسیلی یاسای نورو رۆح دەکات کە(هێز بۆ هەقە) لەگەڵ یاسای خاكو دارستان کە(هەق بۆ هێزە) ئەم یاسایە کە(هەق بۆ هێزە) لەم سەردەمەدا لە کۆمەڵگاو نێونەتەوەکاندا خۆی لە رەگەز پەرستیو دەمارگیریو سیاسەتی هێزو زاڵبوونو کاولکاریو دەستدرێژیکردنە سەر گەلان دەبینێتەوە هەروەها لە هەل قۆستنەوەو زوڵمو زۆری داگیرکەرانو لێکهەڵوەشاندنەوەی یەکپارچەیی ئەو گەلانەو لە ناوچونی خورەوشتیان.

لەبەرئەوە ئەی بەیدەبا لەسەر رۆڵەی هەموو نەتەوەو شارستانیەکانە بزانن‌و یەقینیان هەبێت پێش ئەوەی هەموو شتێك لەدەست بچێت‌و بگەنە قۆناغی راهاتن لەسەر کردەوەی خراپ‌و چەوت، کام بیرو بۆچوونیان هەیە وە بۆلای کام یاساو رێگا دەڕۆن‌و پاپەندن پێی. ئەی بەیدەبا ئەوەی بۆچوون‌و مەبەست‌و ئاراستەی لای رۆشن بوو ئەوە لە کارو هەوڵی دروست دایە بەڵام ئەوەی بۆچوون‌و ئامانجی خۆی نادیار بوو نەیئەزانی بەلای کام کۆمەڵیان پاپەندەو بەکاملا دەڕوات‌و لەکوێدا دەوەستێتەوە ئەوا وورەو بەرزێتی‌و شکۆیی بەرەو لاواز بوون دەچێت‌و لە کار رائەوەستێ‌و ئاوەدانیەکانی دەڕووخێت هەتا تەواو گۆشە نشین‌و دوور ئوخرێتەوە لەبەر ئەوە ئەی بەیدەبا زۆرینەی نەتەوەکان دەبینین پایەو شکۆیی خۆیان لەدەست داوە لە کاتێکدا بیرو بۆچوون‌و بینینشیان نادیار بووەو بەرنامەیان چەواشە کراوە نابینا بوون‌و چەندەها شتی پڕو پوچ‌و جادوو زاڵ بووە بە سەریاندا هەروەها سەر گەردانی‌و ترس‌و تۆقین لەناخیاندا وە بەشێوەیەکی راستە قینە مانایەك لە بوون‌و ژیانیاندا نەماوە. ئەم نەخۆشیانەش هەموو رۆڵەکانی گرتۆتەوە کە نیزامیان تێك رماوەو بوونەتە نێچرو دەستە مۆی داگیر کەران‌و چاو چنۆکان. لەبەر ئەوە یەکەم خاڵێك پێویستە لەسەر بیرمەندو خاوەن راوێژو چاکسازەکان کار بکەن لەسەر ئاشکراو رۆشن کردنەوەی بینش‌و روانگەی ئوممەتەکانیان. بۆ ئەوەی خەڵکی ژیانی خۆیان بەدەستێکی راست بگرن‌و بۆ خواست‌و داخوازیەکانیان هەوڵ‌و تەقەلا بدەن‌و بۆ پێکهێنانی شارستانیەکەیان داهێنان بکەن ئەمە ماناو ئامانجی بوون‌و ژیانە نەوە لەدوای نەوە، بە شێوەیەك یەکەم گۆرانێکی سەرەکی بریتییە لە پێشکەوتنی شارستانی‌و داهێنان‌و ئاوەدانی کە بۆ ئەوە خوا ئادەمیزادی دروست کردووەو بەو شێوەیەش ئەیەوێت. نمونەی ئەو گەلانە لە خواست‌و بیرو بۆچوونەکانیاندا، ئەی بەیدەبای دانا وەکو پڵنگێکی راوکەر وایە کاتێك ئاسکێك دەبینێت وەکو رەشەبا بەدوایدا دەردەچێت لەدوای ئەوە کە بەئارامی پێی هەڵگرتوەو تەمبەڵانە ملی ناوە نازانێت بەرەو کوێ‌و بۆ کوێ دەڕوات، یان نمونەی رێوییەك لەدارستانێکدا پیاسە ئەکات وەك خۆ بەزل زانێك هەنگاو دەنێت لەکاتێکدا کەروێشکێك دەبینێت هەڵئەبەزێت بەشوێنیدا بەهەموو هێزو فێڵییەکەوە زەوی دەبڕێت هیچی لێ دەست ناکەێت جگە لەماندوێتی‌و هیلاکی. هەروەها خاوەنی ئەو تێڕوانین‌و بیرو بۆچوونە وەکو ئەو مەیمونە وایە کە لەچالاکی‌و ووزەی خۆیدایەو یاری لەسەر لقەکان ئەکات زۆر بەهێواشی لەکاتێکیشدا چاوی بڕیوەتە میوەیەك کە لەسەر چڵە پۆپەی درەختەکەدایە، بەڵکو من پرسیار لەتۆ ئەکەم ئەی بەیدەبا: ئەگەر تۆ

تەمبەڵو سەرگەردانبیت هیچ بیرو راو ئامانجێکت نەبێت بگەڕێیت بەشوێنیدا ئایا هیچت بۆ دەکرێت، یان بەبێ دەنگی دابنیشیت هیچ داواکاریوهەوڵێکت نەبێت؟ دەی کەوت بە پێچەوانەشەوە ئەگەر تۆ خاوەنی بیرو بۆچوونو ئامانجو پێویستیەك بیت! بیری لێ ئەکەیتەوە نەخشەی بۆ دائەڕێژیت و هەوڵی بۆ ئەدەیتو بەشوێنیدا دەچیت هەتا ئەگەیتە مەرامی خۆتو پێداویستیەکانت بەجێ دەهێنیت. هەتا داوات لێ ئەکەم سەیری منداڵەکەت بکە لەکاتێکدا پێویستی بەشتێك هەیە، یان بیر ئەکاتەوە باشتر وایە چی بکات بەراوردی ئەم هەڵوێستەی بکە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی کە هیچ هەستو ئارەزوویەکی نەبێت بۆ بەدی هێنانی شتێك. ئەمەش سونەتێکە لەسونەتەکانی بوونەوەر ئەوەی لێی بێ ئاگابێت باجەکەی ئەدات. بەڵێ ئەی بەیدەبا ئەمە حاڵی ئەو کەسو نەتەوانەیە کە بێ ئامانجو بیروڕاو بەرنامەیەکی فیکری دروستن لەبەر ئەوەدەروازەیان نییە بەرەو داهێنانو ئاوەدانکاری بەڵام گرنگتر ئەوەیە سەرچاوەی ئەو ئامانجو بۆچوونانە بە پێوەرێکی راستەقینە بێت بۆ مانای بوونی مرۆڤ کە داهێنانو ئاوەدانی بەرپادەکات بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە بۆی دیاری کراوە لەسەر زەویدا. کەئایا لەپێناوی راستیو داد پەروەریدایە؟ یان لەپێناوی زوڵمو زۆر داری؟ یان لەپێناوی خێرو چاکخوازی؟ یاخود لەپێناوی شەڕو خراپەکاری؟ بەڵێ گرنگ ئەوەیە لە ژیانو بووندا ئەم خاڵانە نادیار نەبن سەبارەت بە هەرکەسێکی ژیر هەتا ژیان بەفیڕۆنەچێت، ئەویش ئەوەیە ئەو ژیارو نەتەوانە بەرەو کام ئامانجو مەبەست هەوڵو کۆششی خۆیان ڕێك دەخەن ئایا بۆ سەرخستنی هەقو دادپەروەریو چاکەو ئاشتییە؟ یان بۆ زاڵبوونی زوڵمو زۆرداریو دەست درێژییە. کەواتە ئەگەر مەبەستو بیرو بۆچوونو تێڕوانین ڕۆشنو ئاشکرا بوو هەرکامێك بێت ئەی بیدەبای پەندیار ئوممەتەکان خۆیان ئەزانن چی ئەنجام بدەنو ئەزانن چی بگرنو چی واز لێ بهێنن، ئەوەی ئەیکات ئەنجامی دەداتو ئەوەی وەری ئەگرێت وەریئەگرێتو ئەوەی وازی لێ دەهێنێت دەست بەرداری ئەبێت بەڵام بەهەوڵی راستەقینەو هێزو نوێ سازی. هەروەها سەرکەوتنو سەر فرازیش لەوەدایە ئەم کارە لەپێناوی خێرو چاکە دابێت نەك لە پێناوی خراپەو پاشەڕۆژێکی خەسار. بەیدەبا وتی: بەڵێ ئەی مامۆستای پایە بەرز گومان نابەم ئەوەی لە نێوانماندا رویدا وقسەت بۆ کردم لەم بارەیە هەمووی روون کردنەوەی داواکارییەکانی من بوو ئێستا تێگەیشتم بۆچی بەشێکی زۆری نەتەوەکان دواکەوتنو هەوڵەکانیان پوچەڵ بوویەوەو راپەڕینەکانیان کوژایەوە هەر لە مەشخەڵەکەیەوەو نەگەیشتونەتەکاروان هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەرنامەو روانگەو

بۆچوونی چەواشەو تێکەڵو پێکەڵ کراوەو هزرو فکری دواکەوتووەو لەناخەوە روخاوە، کە زەبوونیو داماویو تیاچونی لەدوای خۆی جێ هێشتووە ئەمەش بەناسازاندنو دەردی لاسایی کردنەوەی کوێرانە روو ئەدات‌و وائەزانێت سودمەندو کەڵکی لێ وەرئەگرێت بێ ئەوەی بەراورد بکات لە نێوان حاڵی خۆییو بارودۆخی ئەو کەسەی لاسایی ئەکاتەوە هەروەکو حاڵی ئەو کەسە وایە ئۆکسجین لە دەمارییەوە وەربگرێت لە باتی لە رێگای لوت‌و سییەکانیەوە وەربگرێت کە هیلاك‌و مردنی بەدواوەیە. ئێستا ئەی مامۆستای گەورە ئەو خاڵەی تر چییە؟

مامۆستا وتی: ئەی بەیدەبا: ئەم خاڵەی تر کەگرنگی کەمتر نییە لەهەر خاڵێکی تر کە لەپێشدا بۆم باس کردوویت ئەویش کاری تێکەڵ کردنە لە نێوان چەمك‌و تێگەیشتنەکاندا یەکەمیان بریتییە لە تێکەڵ کردنی زیکرو خوا پەرستی لەلایەك‌و هەوڵ‌وکۆشش لە پێناوی ژیان لەلایەکی تر، بەڵکو زیکرو رێنووماو رێ نیشاندەری هەوڵو فرمانەوە رێ نیشاندەریش هیچ مانایەکی نییە ئەگەر بەرەو کارو دەوڵەمەند کردنی ژیان نەبات هەروەها تێکەڵ بوونێکی دیکە کەحەز دەکەم بۆتی باس بکەم ئەویش تێکەڵی نێوان دەوڵەت‌و نێوان بانگەوازە بەتایبەتی لەکاتی توندی کێشەو روو بەڕوو بوونەوەکانی نێوان نەتەوەو گەلان! لەبەر ئەوە زیان دەگەیەنێت بەداهاتووی پەیوەندییەکانی نەتەوەو شارستانیەکان. کە لە بازنەی وت‌و وێژو هاوکاریو تەواو کاری دەری دەکات بۆ بازنەی ئاژاوەو جەنگ‌و کێشەکان. بانگەواز بریتییە لە سۆزێکی برایەتی مرۆڤایەتی هەروەها ووتەی جوانو رێنوومایی بۆ سەر رێگای چاکە.. لەبەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی مرۆڤایەتی بەرزە هیچ بۆشاییەکی تێدا نییە بۆ کینەو توڕەییو زۆرە ملێو سەپاندن، کەوەکو دەوڵەت‌و بەڕێوە بردنی کاروو بارەکانیو روو بەڕوو بوونەوەی بەرهەڵستییەکانی نییە. دەوڵەت ئەی بەیدەبا ـ بە پێچەوانەی بانگەواز ـ بریتییە لە قەوارەیەکی مرۆڤایەتی بەهەموو پێکهاتووەکانیەوە: واتە دەوڵەت بریتییە لە زەوی. گەل. رێکخستن. رۆشنبیریو نەریت‌و بەرژەوەندییەکان وە ئاینو بیرو باوەڕ کە هەردووکیان ناوەڕۆکی بانگەوازنو یەك بەشن لە پایەو بنەماکانی دەوڵەت. بێگومان بەشێکە کاریگەری هەیە لەسەر ڕەفتاری دەوڵەت‌و کارسازیو کاردانەوەی بەرامبەر دەورو بەرەکەی لە گەلانو وڵاتانی تر، بەڵام بەتەنیا ئەو کار تێکردنەیان نییە، چونکە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکانو بەرژەوەندییان لەگەڵ داگیرکەراندا ئەگەر چی پەیوەندی ئاشتیو دۆستایەتی بێت، یان دوژمنایەتی کە هەر وڵاتێك لەکاتێکدا

ئەبێتە قوربانی دەست ـ درێژ ییەکان ئەوا مافی رەوای خۆیی‌و گەلەکەی روو بەڕووی پەلاماردان ببنەوە و بەرگری لە خۆیی‌و مافەکانی بکات بەهەمو تواناو بەرپرسیارێتییەوە بێ زیادەڕەوی‌و سنور بەزاندن، یان بە پێی ئەو پێویستییەی کە دیاری ئەکرێت بەپێی کات‌و شوێن‌و رووداو لەبەر ئەوەنابێت بە ناوی بەرگری لەخۆ هەستێ بەکاری کاولکاری‌و قەلاچۆکردن کەنە ناچارە و نەئاتاجی پێیەتی بەتایبەتی ئەگەر بەدیلێکی هاوسەنگ هەبوو کەمترین زیانی ئەگەیاند بەدەوروبەری کێشەکە، چونکە ژیانی ئادەمیزادو مافو موڵکەکانی چ مەدەنی بێت، یان سەربازی ـ مافێکی پیرۆزەو ئەرکێکی گەورەیە دروست نییە قوربانی پێ بدرێت بەبێ هیچ بەهانەیەکی رێگە پێدراو. وە بەبێ پێویستییەکی گەورە کەبەبێ ئەوە سەرنەگرێت. ئەمەیەڕاستی پەیوەندی نێوان دەوڵەتەکان. هەروتەیەکیش جگەلەمە هەموو درۆو هەڵخەڵەتاندنە و جەنگی دەروونییە وەبەسەر کەسدا جێبەجێ ناکرێت و باڵ ناکێشێت هەتا بەسەر خۆشیاندا وەدانەرەکەشی پێش هەموو کەسێك بەسەر خۆیدا ئەشکێتەوە وەهەموو رووداوە راستەقینەکان و مێژوو پاشماوەکان شایەتن لەسەر ئەوە کەواتە ئەی بەیدەبا ئەگەر بانگەواز بریتیبێت لەوتەی جوان بۆ چاکەکاری‌و ئیرشادو رێگای راست ئەوا جیهان لەڕوانگەی ئەودا و روانگەی بانگ خوازان تەنیا شوێنی پەسەندی بانگەوازە بۆهەر وڵاتێك پەسەندی کردو باوەڕی پێ هێناوە هەر وڵاتێکیش پەسەندی نەکردو باوەڕی پێ نەهێنا پێویستە بانگەوازەکەیانی پێ بگەیەنن بەهیوای رێنومای‌و قەناعەت کردنیان پێی لەپاشەڕۆژدا بەئیزنی خوا، بەڵام ئەی بەیدەبا دەوڵەت بریتییە لە قەوارەیەك‌و بەرژەوەندییەکان. پەیوەندییەکانی رووبەڕووی ئاشتی‌و جەنگ. دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەبێتەوە لەپێکهاتووەکانی ئایین‌وبیرو باوەڕە، رۆشن بیری خۆی هەیە کەپەیوەندی هەیە بەماف‌و بەرژەوەنییەکانی هەمووئەم خاڵانە هۆکارێکن کە کاریگەرییان هەیە لەسەر رەفتاری دەوڵەت‌و پەیوەندیەکانی. کەواتە جیهان لەڕوانگەی دەوڵەتدا سێ جۆرە ئەوانیش: خانەی ئاشتی (دارالسلم) و خانەی پەیمان (دارالعهد) و خانەی جەنگ (دارالحرب). خانەی ئاشتی (دارالسلم) بریتییە لە ئوممەت‌و وڵاتانێك لەناوەڕۆکدا پێکهاتووە لەیەك کۆمەڵگا، و خاوەنی یەك بەرژەوەندییە پابەندە بەدەستورو یاساو رێسایەکی چونیەك. خەڵکی تیایدا فەرمان رەوایی دەکرێن لەسەر بناغەی یەکسانی‌و دادپەروەری تەنیا هۆکاری ئاشتی‌و مەدەنی یاسای‌و رێگە پێدراوە لەخانەی ئاشتیدا هەروەها جێگای بەکارهێنانی توندو تیژی نییە لەهەر کێشەیەکدا، یان بانگەشەی چاکسازی‌و پاکسازیدا. خانەی پەیمان(دارالعهد):

بریتیە لەچەند دەوڵەتۆکەو وڵاتانێك پەیمانێك پێکەوە بەندیان ئەکات کەجاری واهەیە لە نێوان دوکۆمەڵگا، یان چەند کۆمەڵگایەکدا رووئەدات کەپەیوەندی ئاشتی لە نێوانیاندا هەیە بەسراوە بەمەرجەکانی پەیمانەوە و پێویستە لەسەر لایەنەکان پابەندبن پێی کەواتە ئەرکە لەسەر هەر لایەکیان وەفابەپەیمانی بکات مادام لایەنەکەی تر وەفای پێ ئەکات. خانەی جەنگ (دارالحرب): چەند وڵاتو دەوڵەتێکن کە جەنگو دوژمنایەتی رادەگەیەننو هەوڵی زیان گەیاندن ئەدەن. کەواتە ئەو پەیوەندییە ئەبێتە پەیوەندی جەنگو دوژمن کاری و بەرگری لەخۆکردن. ئەمەبوو ناوەڕۆكو سروشتی بانگەوازو رێگاکانی وەئەوە بوو ناواخنو سروشتی دەوڵەتو پەیوەندیەکانی. بەم شێوەیە بووە لە رابردوواو هەرواش ئەمێنێتەوە هەتا ماوەی درێژ خایەن ئەوکاتەی کۆمەڵو دەوڵەتەکان یەك دەگرنەوە لەیەك کۆمەڵی گەورەداو چڕو پڕ دەبن و قەوارەیەکی ئاشتی جیهانیو لەسەر خاڵی هاوبەش لەدادپەروەریو ئاشتیو هێمنیو ئاسایش لەژێر سایەی یەك بەرژەوەندی و دەستوور یاساو رێسایەکی گشتی رێکەوتوو کەهەموان پابەند بن پێیەوە بەشێوەیەك ئاشتیو ئاسایشیو کامەرانی بۆهەموان بەدی بهێنێت. ئیتر جگەلەمە ئەی بەیدەبا تێکەڵو پێکەڵ کردنو درۆو چەواشەکارییە تەنیا خزمەتی جەنگە دەرونیەکان دەکات بۆئەو دوژمنانەی کە هەمیشە لەکەمیندان گیانی تەسلیم بوونو رووخان درێژە پێدەدەن و گیانی شکۆییو بەرگری دەکوژن لە نێوان قوربانیانی زوڵمو دەست درێژی. کەواتە راست نییە لەجیهانی ئەمڕۆی ئێمەداو جەنگە دەرونیەکانیدا ئاینو بیرو باوەڕیان هەر رەگەزێك لەڕەگەزەکانی گیانی دەوڵەت خۆی بەتەنیا بەرپرسیار بێت، یان هەڵگری ئەو ئەرکەبێت بەرامبەر رەفتارەکانی دەوڵەت، بەڵکو پێویستە بەسەیر کردنێکی گشتیانە سەیری ئەو هەڵوێستە بکات بۆناسینی هۆکارە راستە قینەکان و رەگەزە کاریگەرو بزوێنەرەکان و ئەرکی سەرشان هەروەها دادمەندو لایەنگرانی ئاشتیو دادپەروەری لە گۆترەو هەروا فەرمان رەوایی دەرنەکەن کە پێویستە بەپێی نەخشەو پلانی دوژمنو جەنگە دەرونیە کانیان بێت. ئەی بەیدەبا ئەگەر بیرو باوەڕو ئاینیەکان بانگەشەی ئاشتیو چاو پۆشی دەکەن کەواتە ئەرکیشیانە بڕیاری بەرگری لەخۆ بدەن بەرامبەر ئەوکەسانەی دەست درێژی ئەکەنە سەری. هەروەها راست نییە لایەنەکانی هێزی پەلامار پەنابەرن بۆ پیاوانی ئاینی و بیرمەندان و دەم راستی گەلە ستەم لێکراوەکانو داوایان لێ بکەن و واز لە لابەرهەڵستی بهێن بەرامبەر داگیرکاریەکان بەسەر گەلەکەیانەوەو واز لە پاراستنی مافو خوێنو زەوییان بهێنن. هەروەها دروست نییە داوا لەم گەلە ستەمدیدانە بکرێت بۆ

پەسەندكردنی ملكەچیو سەردانەواندن لەبەردەم هێزی دەست درێژی، بەڵكو پێویستە لەسەریان بەرگری لەخۆیانو مافی ڕەوای گەلەكەیان بكەن بەو ئامراز ستراتیژیانەی كە لەگەڵ تواناو ستراتیژی بەرامبەردا ئەگونجێتو بگەنە ڕێگاچارەیەكی رامیاری لەبەر وشیاو هەتا ئەم میللەتانەو گەنجانی ڕوو بەڕووی ڕووخانو كاردانەوەی نائومێدانە نەبنەوە بەتایبەتی لە كاتێكدا دوژمن ڕووخێنەری قەوارەی ئەم دەوڵەتانەو گەلەكانی بێتو روخێنەری شكۆییو پاشەڕۆژی نەوەكانی بێت لەگەڵ بەرژەوەندییە سەرەكییە رەواكانی..

وەكو دەبینیت ئەی بەیدەبا من لەم سەردەمەو لەجیهانی زلهێزەكاندا لەبارەی ڕێگاچارەیەكی دادپەروەرانە قسە ناكەم كە (سیاسەتی هێز) نایزانێتو نایناسێت، بەڵكو لەبارەی ڕێگا چارەیەكی ڕامیاری لەبارو ژیرانەوە قسە ئەكەم، چونكە ژیر لە(جیهانی زلهێزەكان) و(ڕامیاری دەسەڵات) و (سیاسەتی رۆژگار) و (یاسای دارستان) ناتوانێت قسە لەبارەی چارە سەرێكی دادپەروەرانەوە قسە بكات لەبەر ئەوەی كەبەنەفامو شێت لە قەڵەم ئەدرێت. ئەوەی نكۆڵی لەم گەلانە بكاتو مافی داكۆكی كردن لەخۆیان ئەوە بەهەڵەدا چووە ئەگەر وابزانێت ئەم میللەتە ستەم دیدانە گوێ بۆ ئەو جۆرە بانگەشەو داوا كاریانە بگرن. باقسەكەر هەركەسێك بێت، یان بە ناوی هەرشتێكی ترەوە بێت. وە پێویستە لەسەر داناو هەركەسێ بەرژەوەندی گەلەكەی مەبەستەو ئاشتیو ئاسایشی مرۆڤایەتی لاگرنگە فێربنو پەند وەربگرن لە ئەزمونی كارەساتی گەلانی پێشوو ئەوەی كەخاوەن بەرژەوەندییە تەماعە بێ سنورەكانیانو ئارەزوو هەواو خورافاتی ڕێبازو ڕێچكە دروستیان كرد لەزەرەرو زیانی ماڵیو گیانی بۆ گەلی خۆشیان پێش هەركەسێكی تر وە دەرچونیش لەم جۆرە قەیرانو تەنگانەیە نییە مەگەر گەلان خۆیانو خاوەن ژیرییەكان حوكمو فەرمان ڕەوایی خۆیان بگرنە دەست لەگەڵ بەرژەوەندیو چارەنوسیو گیانی رۆڵەكانیان لەدەستیاندا بێت. بەڵێ ئەی بەیدەبا پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتو گەلانە ئەگەر بە راستی بەتەنگ ئاشتیو ئاسایشیەوەن لەمێژوەوە فێربن و ئەقڵو حیكمەت بەخەرج بدەن لەچارەسەرێكی رامیاریانەی ژیرانە ئەگەر دادپەروەررانەش نەبوو، پێویستە لەسەر، یان پەندو ئەزمون لەو ئیمپراتۆریەتە وەربگرن كەپێی ئەوترا ئیمپراتۆریەتی پیر وەكو ئەڵێن خۆر لێی بزر نەئەبوو؟ ئەو ڕێگایەی كە ئەم ئیمپراتۆریەتە گرتبویە بەر لەگەڵ فەرمانڕەوا سیاسییەكان تیایدا لە كاتێكدا گەیشتبوونە چڵەپۆپەی دەسەڵات لە بەرامبەر گەلو بزوتنەوە نەیارەكانیاندا سیاسەتێكیان بەكار ئەهێنا بە پێچەوانەی سیاسەتی گێلانەی غەیری خۆیان وازیان لە ڕەفتاری توندو تیژیو كوشتو

بڕی هێنا لەبەر ئەوەی زۆربەی دەسەڵاتو دەسکەوتەکانیان ئەپاراست بەبێ جەنگو خوێن ڕشتنی هەروەکو پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتە لە سنوور دەرچوانەی بەهێزوو دەسەڵاتیان بایی بوون پەند وەربگرن لەڕوخانی چەندەها زۆردارو نەمانی چەندین ئیمپڕاتۆرییەتی گەورەی کاولکەر ئەوەش کەڕویدا بەهۆی هەڵ کشانەوەو رشتنی خوێنو داهاتەکان بە بەرهەڵستی گەلە چەوساوە ژێر دەستەکان کەزوڵمو زۆرو نائومێدی باڵی کێشابوو بەسەریانداو لەبەر زۆری چەشتنی ئەشکەنجەو ئازارو ماڵ وێرانی لەناخیانەوە هەوڵیان ئەدا بۆ بەرهەڵ ستکردنو تۆڵە کردنەوەو زۆر بوێرانە بەرگەی ئەو هەموو کارەساتو رەنج بێوەریەیان ئەگرت هەروەکو هیچیان بۆ نەمابێ بۆی بگرینو رۆڵە رۆی بۆ بکەن ئەی بەیدەبا مێژوو پڕیەتی لەدەرسو ئامۆژگاری بۆ کەسێك کەبیەوێت پەندو عیبرەتو وەربگرێت. بەڵێ تەنیا رێگایەکی راستو دروست لەپەیوەندی نێوان نەتەوەو گەلاندا بەتایبەتی لەم سەردەمەداو ئەوەی کەمرۆڤایەتی خاوەنێتی لە ئامێرەکانی فەوتاندنو کاولکاری ، بەڵام زوڵمو توندو تیژی و یاری کردن بەخوێنو گیانو سوربوون لەسەر سیاسەتی هەڵە هەر رەنجەڕۆییو توندوتیژی زیاترو زۆری لێ دەبێتەوە بۆهەموو ئەو لایەنانەی پێوەی گیرۆدەن وەپێویستە لەسەریان - ئەگەر پەندو ئەزمونیان وەرگرتبێت - پەشیمان ببنەوە و بەئاگا بێنەوە وەبەئەقڵ و داناییو میانەی سنورێك بۆکێشەکانیان دابنێن با لاواز بزانێنت زەبرو زەنگی بەهێز وێرانکەرو بەژانە خێری تیانییە بەدوایدا بگەڕێیت بەهێزیش بزانێت هەرچی کارەساتو کاولکاریو دەربەدەریو سەختی گەیاندوویەتی بەسەر قوربانییەکانیدا بەهەمان رێژە پێوەی ئەگلێتو ئەناڵێنێت. گرنگ ئەوەیە ئەی بەیدەبا ئەرکو بەرپرسێتی دەست درێژو دەسەڵاتدار گەورەترە بۆ بەرێوەبردنی چارەسەرێکی رامیاریانە کەستەمووداگیر کاریەکان لاببات‌و هاندەرەکانی بەرەنگارییو توندوتیژی لاوازبکات و زاڵبێت بەسەرگریانی تۆڵەکردنەوەو پاڵنەرەکانی لەدەرونی مرۆڤایەتیدا . بەمەش ئەتوانرێ ئاشتییو تەبایی جێگای کێشەوخوێن رشتنو توندو تیژیو تۆڵەکردنەوە بگرێتەوە لە دڵەکانداو بەمەش بیرو باوەڕو ئاینەکان هێزی کاری گەرییان بۆ ئەگەڕێتەوە لە بانگەوازدا هەروەها جێگرتنەوەی پاڵپشتەکانی ئاشتییو پەیوەندی لە نێوان گەلو دەوڵەتەکاندا. ئەگەر ناو بە پێچەوانەوە با شەڕەنگێزو داگیر کەران تەنیا سەرزەنشتی خۆیان بکەن مامۆستای گەورە لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو وتی: گرنگ ئەوەیە ئەی بەیدەبا میللەتە بێ دەسەڵاتەکان تێبگەن ئەگەر ئێمە دەستمان گرت بەسەر رەوشی دەروونەکاندا لە نێوان تاكو نەتەوە، بە تایبەتی ئەگەر بایی بوون بە هێزو توانایان و

ئەگەر پاڵنەرەکانی تەماعو چاوچنۆکی دەستی کێشابوو بەسەریاندا، ئەوا ئەم ئوممەتە لاوازانەش بەلاوازییەکەی خۆیان بەشیان هەیە لە وروژاندنی تەماعی چاو چنۆکانو دەستی زۆرداران هەروەها بەشێکن لەو هۆکارانەی کەدەست درێژی ئەکرێتە سەریان. هەروەکو وێنەی مەڕێکی هەژارو بێ دەسەڵات کەهیچ سەگێکی پاسەوانی نەبێت، لەبەر لاوازی مەڕەکەو نەبوونی سەگی پاسەوان کە بەرگری لێ بکات ئەبێتە هۆی وروژاندنی حەزی راوکردن لەدڵی گورگێکدا. کەواتە هێزو توانا شتێکە هەموو گەلودەوڵەتێك پێویستیان پێی هەیە لەم جیهانەدا. توێژینەوەو لێکۆڵینەوە. زانستو تەکنیك کارو بەرهێنان بەکارێکی جوانکاریو خۆشگوزەرانیو تەواوکاری (کمالیات) نەماوە بەڵکو بە واتاو پێناسەی سەردەمو تواناو دەرکەوتنو بەرەنگارییەکانی، هەروەها بەپێی سروشتی ئەو دەسەڵاتانەی کە پڕیەتی لەنازین بە تەماعو سوور بوونو ئارەزووی زاڵ بوونو سیاسەتی هێزو بەرژەوەندییە نەتەوایەتیەکان بریتیە لە ئەركو پێویستیەکی سەرەکیو حەتمی بۆگوزەراندنو مانەوەو رەفتارو هەڵسوکەوت لەم جیهانەدا وەك هاوبەشو هاوکارێك نەك نێچیرێك. وە پێویستە لەسەر ئاشتی خوازان یارمەتی گەلە چەوساوەکان بدەن بۆئەوەی راپەڕن و دەربکەون تاببنە هاوبەشێك و بەرژەوەندییەکان بگۆڕنەوە لەگەڵ گەلانی تردا نەك وەك نێچیرێك کەدڕندەکان شەڕبکەن لەسەری بۆلەت کردنی لاشەکەیو بەش بەش کردنی گۆشتەکەی. بەرامبەر ئەوەش ئەی بەیدەبا پێویستە ئەوگەلو نەتەوانە بزانن کە سەرۆکایەتی خۆیان تەسلیمی داگیرکەرو تەماع بازانو خاوەن بەرژەوەندی تایبەتییەکان کردووە بەبەرتیلی ئەم گەلانەوە لە لایەن بەرپرسەکانیەوە بەرامبەر قسەی درۆو ساختەو گفتی هەڵبژاردنیان بۆهەندێك لەوکاروبارانەی کەپەیوەندیان هەیە بەژیانی ناوخۆیی تایبەتیانەوە وەك فێربوونو(تأمین) مسۆگەرکردنی تەندروستیو کۆمەڵایەتی و دابینکردنی کارو چەند شتێکی تر. بەرامبەر بەدەستەوەدانی چارەنوسی خۆیان و چارەنوسی خوێنی رۆڵەکانیان هەروەها تەسلیمکردنی بڕیاری ئاشتیو جەنگو پەیوەندییان بە میللەتو دەوڵەتانی ترەوە، ئەویش بۆ بەدیهێنانی راو بەڕێوەبردنە شەڕانیەکانیانو دەست خستنە نێو کاروباری ئەم وڵاتانەوە بۆ ئەوەی ووزەو داهاتو خوێنی رۆڵەکانیان موسەخەر بکەن چۆنیان بوێت بیڕێژن بەڵام ئەو قوڕ بەسەریە خۆشیان ئەگرێتەوە پێش کەسانی تریش. هەربەم شێوەیە ئەمڕۆ زۆربەی میللەتان دەبینین بەتایبەتی میللەتی دەوڵەتە گەورەو زلهێزەکان باجێکی گەورە ئەدەن لەکاتێکدا کەمتەرخەمن بەرامبەر سیاسەتی دەرەکیو ناوەکی وڵاتەکەیان سەبارەت بەچاودێرییان لەسەر وڵاتانی تر. ئەو

میللەتانەی کە سەرۆکاریان داوەبەدەستی کەسانی نەخۆشو مشەخۆر و خاوەنی بەرژەوەندی تایبەتی ئەی بەیدەبا نمونەی خۆیانو سەرکردەکانیان وەك ئەو بەرخە وایە کە ئالفو گژوگیا لەدەستی قەسابەکە ئەخوات، بەلکو هەولی بۆ ئەداتو ئەڕوات بەشوێنیدا و داوای ئەو ئالفە دەکات کەبریتییە لەو بەلێنانەی پەیوەندی هەیە بە بەڕێوەبردنی خۆمالیو کاروبارە ناوخۆییەکان لەکاتێکدا نازانێت ئەوەی پێی ئەگات نەغەنیمەیەو نەدەستکەوتە نە سودو قازانجە، بەلکو ئەو خۆراکەیە کەقەسابەکە ئامادەی ئەکات بۆ بەرخەکەی پێش ئەوەی بیبات بۆ قەسابخانە بۆ سەر بڕین. وە بریتییە لە جەنگی سیاسەتی دەرەکی کە بە راستی بۆ ئەم میللەتانە نە مێ ووشتر نە نێرەی تیانییە، چەندەها ئەو سەرۆکاریە نەخۆشو ساویلکانە گەلەکەیان بەرەو جەنگو کوشتارگای ئادەمیزاد بردووە کە هەزارانی تیاچووە، بەلکو ملێونها لە رۆلەکانی گەل. بە راستی ئەی بەیدەبا ئەگەر ئەم میللەتانە بیریان بکردایەتەوەو تێ بگەیشتنایە چییان بۆ نەوتراوە ئێستا کاتی بوو ـ لەگەڵ ئەو هەموو زەرەرو زیانەدا ـ کە ژیر بنو بەئاگابێنەوە وە سیاسەتی دەرەکیان واز لێ نەهێنن بەبێ چاودێریو لێپرسینەوە ئەمڕۆ حالی ئەم میللەتانە لەگەڵ سەرکردەی ولاتەکەیانو کەمو کوڕییان سەبارەت بە سیاسەتە نێودەولەتەکەیان وەکو حالی بەرخو قەسابەکە وایە کە لەبارەیانەوە وتراوە، ئەگەر ژیر بوایە نە تەماعی ئەبوو نەتامی ئەکردو نە قەلەویش ئەبوو بەو گژو گیاو جۆو ئالفەی کە لە دەستی قەسابەکەدایە بۆ ئەوەی چارەنوسی نەمانو سەر بڕین بێت. هەرواش خوێنی رۆلەکانی ئەم گەلانە بووەتە خۆراکی لە خۆبایی بوونی سەرکردەکانو بەرژەوەندی مشەخۆران. چەند باری ئەو میللەتانە گرانە بێ دەسەلاتو دەسەلاتداری کە لە بێ ئاگاییدا ئەژیانو داماون لە نێوان حالی ئەو بزنەی کە لە دەمی گورگێکدایەو حالی ئەو بەرخەی کە لە دەستی قەسابێکدایە چەند چارەنوسێکی رەشە. چەند پێویست بوو ئەم گەلانە چارەنوسو ڕامیاری ناوخۆییو دەرەکیان بگرتایەتە دەستو دەستی ئەو کەسانەی کە خۆیان دەست نیشانیان دەکات لە سەرکردە دلسۆزەکانیان ئەوکاتە لاوازو چەوساوە هەلئەسانەوەو ئەبوونە هاوکارو هاوبەشی یەك بەرژەوەندیو ئاشتی بەهێزو تواناش دەستی ئەگرت بەسەر چارەنوسو ڕامیارییەکانی لەوانە دەرەکیو ناوەکیو گیانی رۆلەکانیو بەرژەوەندییە راستەقینەکانی ئەپاراست هەتا هەموو گەلو دەولەتان ببنە هاوبەشی یەکو هەولْ بدەن لە پێناوەی ئاشتی مرۆڤایەتی هەر مرۆڤێكو ئاسایشی هەر مرۆڤێك، خۆش گوزەرانی هەر مرۆڤێك، زەویش بەری فراوانەو تەنگەبەر نابێتەوە بەڕزقو رۆزیو پێداویستیەکانیان.

سەرزەمین هەر بەوشێوەیەبوو. بەویستی خوای گەورەش هەرواش ئەمێنێتەوە کەی‌و چۆنی بوێت. ئەی بەیدەبا بەبێ یەکبوونی مرۆڤ بۆ مەبەستی خێرو بەبێ کارو کۆششەکانی لەپێناوی چاکەو راستی‌و دادپەروەری‌و ئاشتی‌و بەزەیی ئەوە بەشێوەیەکی راستەقینە نە مرۆڤەو نە ئاوەدانیەو نە شارستانیە، بەڵکو بریتییە لە ستەم کاری‌و کێشەی ئاژەڵانە کە چارەنووسەکەی بەرەو خوێن رشتن‌و کاولکاری‌و قەلاچۆکردنە. وە ئەوەی تێپەڕی لە مێژووی نەتەوەکان‌و کێشەکانیان شایەت‌و ئاگادار کەرەوەن. لەکاتێکیشدا جەنگ‌و کێشەی ئەمڕۆ گەورەترەو ماوەکەی فراوانترەو ئامێرەکانی کوشندەترو وێرانکەر ترە. ئەی بەیدەبا؟ مرۆڤ نەشونمانی کردووەو پێش کەوتووە لەڕێڕەوی زانست‌و زانیاری‌و تواناو گەشتنی بە گەردوون ئەمڕۆ بەزانست‌و زانیاری توانای هەیە لەسەر فێربوون‌و پەند وەرگرتن لە مێژووی مرۆڤایەتی‌و کە لەپورییەکەی بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ تێرو تەسەلی‌و رێنومایی کردنی بەرەو رێگای راستەقینەی ئاوەدانی‌و شارستانی. وە پێویستە لەسەر هەموو دڵسۆزو چاکسازو بیرمەندان بەگیانی کۆمەڵ‌و هاوکارییەوە هەوڵی راستەقینە بدەن بۆ پێشکەوتن بەرەو ئەو رێگا راستەو بەدی هێنانی ئامانجی بەرزو گەورە پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت. ئەی بەیدەبا هەموو ئەم گەشبینی‌و هیوایە بۆ ئەوەیە ئەو ترازووە هاوسەنگ بێتەوە وە ئەوفیترەتەی کەخوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردووە رێگانادات یاسای دارستان لە جیهانی مرۆڤدا زاڵ ببێت‌و زوڵم‌و زۆردای‌و خراپەکاری لەسەر شارستانی مرۆڤ سەربکەوێت پێویستە سروشتی هەق‌و دادپەروەری‌و ئاشتی‌و بەزەیی بگەڕێتەوە ئەوەش بەدەستی گەنجانی باوەڕدارو کارسازو چاکخوازو لەخوا ترس دروست دەبێت ئەی بەیدەبا: ئەمەش دێت لەکاتێکدا بیرو باوەڕو شکۆیی راستەقینە دەبێت‌و تێڕوانین‌و بیرو بۆچوونی گەردونی راست دەبێتەوە بەڵێ ئەوەی دەبێت بەبێ گومانی ئەگەر بینیشمان رۆشن بکەینەوە بەم نزیکانە بەئیزنی خوا. لەم کاتەدا شێخ لەقسەکانی راوەستا بۆ ئەوەی قومێك ئاو بخواتەوە، بەیدەبا بەهەلی زانی روی کردە شێخ ئیبن بەتوتە وتی: ئایاشتێکی تر ماوە لەدوای ئەم ووتە بەرزو بەنرخانە گەورەم؟

پیری گەڕۆك وتی: بەیدەبا خاڵێکی تر هەیە حەزدەکەم باسی بکەم. ئەویش مەبەست لەدرێژەپێدانی قسەکانم بۆ تۆو خوشك‌و براکانت لە خێر خوازان‌و چاکخوازان بەدرێژایی ئەم رۆژانە لەکاتێکدا بەشارەزایی‌و ئەزموونی زۆردا تێپەڕیوم ئەی بەیدەبای دانای ئەدیب. بەیدەبا وتی: ئەوە مەبەستت چییە ئەی مامۆستای گەورە ؟ ئەوا من هەنگاو هەڵنانێم هەتا

داواکارییەکانت جێ بەجێ نەکەم. شێخ ئیبن بەتوتە وتی: بەیدەبا تۆ ئەزانیت من هیچم نەویستووە جگە لە چاکخوازیی نەبێت ـ ئەجەلیش وا نزیك بووەتەوە خەریکە وا کۆچ ئەکەم لە دنیای خاكو نەمان بۆ جیهانی رۆحو هەمیشەیی، لەم دونیایە بار ئەکەم وەکو هەر ئادەمیزادێك و گەشتەکەم بەرەو جیهانی رۆح بەڕێ دەکەم، بەڵام بەبێ هیوا لە پاشەڕۆژێکی باشتر بەم نزیکانە و ژیانو داهاتوویەکی بەرێزترو گەورەتر بۆ مرۆڤو نەوەی ئایندە لەم سەرزەویەدا، هەروەها بەبێ ئومێد لە شارستانیەکی پرشنگداری بەرزو خاوێن بۆ مرۆڤایەتی، لەبەر ئەوە ئەی بەیدەبا منت ئەبینی لە رۆژانی رابردوودا کە سوور بووم لەسەر نقڵکردنی ناوەڕۆکی بیرەوەریو ئەزمونو شارەزاییە ـ کانم لەژیاندا. بەم شێوەیە مەبەست لە قسەکانم بۆ خۆتو خوشكو برادەرانت لەشاگردانی زانستو چاکسازیدا تەنیا بیستنی قسەکانم بەس نەبێت بۆتان، بەڵکو پێویستە لەسەرتان هەرچیەکتان وەرگرتووە بیگەیەنن و هەرشارەزاییەکتان پەیدا کردووە ڕای بگەیەنن بەگەورەو بچوك. پیرو لاو لەنەوەکانی پاشەڕۆژ, بەتایبەتی تۆ ئەی بەیدەبا. تۆزیاتر، چونکە ئەتوانیت لەسەر شێوەی چیرۆكو خوان بیانچنیت وەلەبەرەوەی منداڵو گەنج لە سەرەتای تەمەنیانەوە سەختە بۆ ئەوان ئەو هەموو بابەتو بیرۆکەو ئەزمونانەی کەپیاتێپەڕین هەرس بکەن وە زۆرجار دەستو چاویان ناتوانێت بگاتە زۆربەی چاوگەکانی. وە لەبەر ئەوەی ئەوشێوازە داناییەی تۆبەکارت هێناوە لەباسو چیرۆكو سەرگوزەشتەوئاخاوتن بەهۆیەوە ئاسانترو روونتر دائەنرێت بۆگەیاندنی ئەم شارەزاییو ئەزمونەو سوود پێگەیاندنی نەوەکان هەروەها رێگایەکە بۆ گواستنەوەی ئەوانەی کە لە نێوانماندا روویدا بۆدروستکردنی بۆچوونو شارەزاییەکی راستو دروست لەناخیندا هەرلەسەرەتای تەمەنیانەوە پێش ئەوەی لەشیانە دابڕێژن. کە یارمەتیان ئەدات لە بنیاتنانی بیرو ویژدانیانو هەوڵو رێڕەوی ژیانیان راستو بەردەوام ئەکاتو باسوودی لێ وەربگرن پێش ئەوەی ژیانو شوێنی دروستکردنو پەیداکردن جێ بهێڵن. هەروەکو چارەنوسی باوو باپیرانمان لە رابردوودا هەمان شتیش کە ئێمەش دەگرێتەوە بۆئەوەی راپۆرتی لێ پرسینەوەو کارە سودمەندو بەنرخەکان بدەن بەدەستەوە ئەو هەوڵو تەقەلایەی بەکاریان هێنا بۆموسەخەر کردنی ژیانو ئاسانکردنی بۆ خەڵکیو دروستکراوەکانی دی بەکردەوەی چاکەو پێك هێنانی شارستانی بەوشێوەیەی کەخوای گەورە ویستویەتی بەکار بەجێیو سۆزی خۆی بۆبەندەکانی هەر بەوشێوەیەش دەیەوێت. بەیدەبا وتی: بەڵێ مامۆستای گەورەم منو خوشكو برادەرەکانم ئەوەی کە لێمان وەرگرتووەو بیستووە تەنیا بۆ خۆمان هەڵی ناگرین، بەڵکو

ئەیگێڕینەوەو ئەیکەین بە چیرۆك بۆ خەڵکی بۆ گەورەو بچوکیان بەتایبەتی گەنجو منداڵ هەتا سود مەندبن بەفەرمانو بیروڕا پڕ لە داناییو شارستانیەکانتو یارمەتییان بدات بەرەو سەرکەوتنو رزگاری بە ئیزنی خوا، ئامانجی گەورەو بەرز بەدەست بهێنن بۆ خۆیانو گەلەکەیانو هەموو دەورو بەریان، ئەو ئامانجەی کە دەرونی ئێمەشو جەنابیشت پێی تینووەو ئاواتی بۆ دەخوازیت. مامۆستا ئیبن بەتوتە بەبیستنی ئەم قسانە دڵشاد بوو خەندەیەك گرتیو گۆچانەکەی گرت بەدەستەوە بۆ ئەوەی ماڵو ئاوایی لەبەیدەباو برا دەرەکانی بکات.

بەڵام لەم کاتەدا کچێکی شۆخ لەئامادەبووان لەدوای ریزەکانەوە بەشەرمێکەوە رووی کردە مامۆستا وتی: مامۆستای گەورەمان رێگام پێ دەدەیت قسەیەك بکەم؟

مامۆستا سەیری روخساری گەشو شەرمە جوانەکەی کرد، وتی: کچەکەم قسەبکە واگوێت بۆدەگرم. کچەکە وتی: گەورەم خوا پایەبەرزت بکات تۆ ئەزانیت کە ئێمە چەند تۆمان خۆش ویستووەو بەهرەمەند بووین بە وتە جوانەکانت لەگەڵ داناییو شارەزاییو رێزداریت، من حەزئەکەم بەردەوام لەلات بمو بەختەوەربم بەهاوڕێیەتیت ئایا پەسەندی ئەکەیت ببمە خێزانتو لەگەڵتا بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەت و لەگەشتەکانتدا لەگەڵت ببم و یارمەتی کاروبارەکانت بدەم؟ بێگومان ئەوە کەمترین شتێکە لە ئێمەوە کە شیاوی پیاوێکی دڵسۆزو تێکۆشەری وەك جەنابت بێت؟

ئامادەبووان هەموو لایان بۆ کردەوەو لەبەر خۆیانەوە دەستیان کرد بەچپەو پێکەنینو سەریان ئەلەقاند بۆ پشتگیری قسەکانی. مامۆستا بەنەرمییەکەوە سەیری کرد، دیتی کچێکە کە لە مانگ جوانترە رووی تێکردو وتی: رۆڵەکانم ئێوە دەزانن من مۆڵگەی رێزو خۆشەویستیم بۆ گەنجانی عیلمو چاك خوازی، بەڵام وەکو دەزانن پیاوێکی گەشتیارو گەڕیدە شوێنی جێگیری نییە لەگەڵ ئەوەشدا لە زەوی نیشتمان خێزانو کوڕو کچو نەوەی هەیە، من پەیمانم داوە بەخێزانم ئەویش پەیمانی داومەتیو بە لاییەکەوە هەست بە ئەمان ئەکەین، خەم خواردنو دڵسۆزی بۆ یەك و ئاسوودەیی پەیوەندی نێوانمانی پتەو کردووە، ئەوەش نهێنییەکە بەپاڵ رێزگرتنو پێزانینی یەکتری لە نێوان هاوسەران و ئەندامانی خێزان کە لە گرنگترین نهێنییەکانی خۆشبەختی خێزانو حەوانەوەو جێگیر بوونیتی. براکانم ئافرەت ئەگەر لەدڵەوە ئەمینو ئاسوودە بوو لەمێردەکەی و هەستی بەبەخشندەیی هاو ـ سەرەکەی و قوربانیەکانی ئەکرد و بێ گومان بوو لەوەی هەرگیز دەست بەرداری نابێت ئەوا تەواوی گیانی خۆیی و

پێداگرتنو پشتگیری پێشکەشی مێردو منداڵەکانی ئەکات ئەو کاتە لەناوەندی خێزاندا سیخوڕی کردنو موحاسەبەو بەرژەوەندی جیاواز نامێنێت. لەلایەکی ترەوە خوشکەکانم پێویستە لەسەر ژن ئاگای لەخۆی بێت گوێ بۆ ئەوئامۆژگاریە گێلو زیانبەخشانە نەگرێت کەئەبنە هۆی وروژاندنی غیرەو دڵ پیسی پیاوەکەی، چونکە ئەسڵی بناغەی خێزان و پەیوەندی هاوسەرایەتی وورد ئەکات و حەوانەوەیان لێ هەڵئەگرێت، چونکە بەخشینی ئاسوودەییو ئارامی بۆ ئافرەت لە لایەن مێردەکەیەوە هەروەها متمانەی پیاو بەپاك داوێنی خێزانەکەیو پاراستنی حورمەتی خۆی و منداڵەکانی، دووبنەمای گەورەن کە خێزانێکی چاكو بەختەوەری دامەزراوی لەسەر دروست ئەبێت کە کەئەو ژنو پیاوە دەروازەکانی ژیانی تیا دەبڕن بەشیرینو تاڵیەوە بە پشتیوانیو شانبەشانی یەك. ئیتر خوشكو براکانم بزانن مانای خێزان نییە بەشێوەیەکی راستەقینە بەبێ ئەو دوو بنەما سەرەکییە؟ هەموو ئەمانەو جگە لەوانیش هەرناکۆکیەکی هاوسەرایەتی هەبوو ژنو پیاو ئەتوانن پەیوەندیەکەیان بەئەدەبو رێزگۆڕینەوە و نرخاندن پتەو بکەن. وەبەژیرییو دانایی بگەنە پەیمانو پەیوەندییەکی بەتینو دەربڕینی هەستی سۆزو خۆشەویستی بەرەو چاکسازی و ڕەوینەوەی خراپیەکانیو پێکەوە ژیانو زۆرلەو بابەتانە. ئازیزەکەم لەبەر هەمووئەمانەو لەبەر ئەوەی کەمن پیاوێکم پیر بووم و بێ گومان ئەجەل لێمەوە نزیکە. تۆئەوکاتە ئەزانیت من ئەو پیاوە نەبووم کەشیاوی ئافرەتێکی شۆخو جوانی وەك تۆ بێت لەسەرەتای تەمەنیدا، بەڵام ئیزنت لێ وەرئەگرم وەکو باوکێك پەسەندم بکەیت داوات بکەم بۆ کەسێك کەبەشیاوی بزانم و لەکەسایەتیدا زیرەکیو لێهاتوویی ببینیتو لە چاوەکانیدا هەستی شەوقو خۆشەویستی ببینیت و باشترین هاوسەربێت بۆ تۆو باشترین باوك بێت بۆ منداڵەکانتو باشترین هاوڕێ بێت لە گەشتی ژیانی بەختەوەریدا بە ویستی خوا. کچەکە سەری داخستو وتی: ئەگەر لەگەڵ خۆتدا نامبەیت ئەوا لە تۆ باشتر نابینمەوە وەك باوکێكو دڵسۆزێك. مامۆستا سەیری گەنجێکی خۆش ئەندامو روخسار جوانی کرد کە لەلای راستی مەجلیسەکەوە دانیشتبوو داوای لێکرد بێتە پێشەوەو لە تەنیشتیەوە دابنیشێت ئەویش خێرا هات بەدەم داواکەیەوە. پاشان مامۆستا ئاماژەی کرد بەگەنجێکی ترکە بەهەڵکەوتوویيو هۆشیاریو زیرەکیدا هاوشانی ئەوی تر بوو داوای لێکرد بێتە پێشەوەو بەتەنیشت هاوڕێکەیەوە دانیشێت گەنجەکە بەپەلەو بەشەرمێکەوە بەهەمان شێوە دانیشت. پاشان مامۆستا دەستی بۆ ئافرەتێکی دی ئاماژە کرد هەروەکو یەکەم بوو لە جوانیو ئێسك سوکیداو داوای لەویش

کرد بەپاڵ هاوڕێکەیەوە دانیشێت. پاشان رووی کردە گەنجەکەو وتی: ئەی کوڕی لاو لە دەستم ناچێت ئەو نیگا شەیدایانەی کە ئەینێری بۆ دەستگیرانەکەت‌و لێم شاراوە نییە نیگا شەرمەزارەکەی ئەویش لە دزەی چاوی تۆ.

پاشان لایکردەوە بەلای گەنجەکەداو پێی وت: کوڕی شیرینم ئیزنم ئەدەیت لەم دانیشتنەدا ئەو ئافرەتەت بۆ داوا بکەم؟ وائەزانم دوو گەنجی هوشیارو هەڵکەوتووی وەك ئێوە شیاوی ئەوەنە ئەو دوو ئافرەتە چاکە ببنە خێزانتان و واش گومان ئەبەم ئێوەش باشترین هاوسەر ئەبن نۆیان. لاوەکان سەیری زەویان دەکردو سەریان دانەواندبوو ووتیان پێی : ئەی مامۆستای پایە بەرز تۆلەجێی باوکی گشتمانی و ئەوەی بۆئێمە پێت خۆشە ئێمە هەمومان پێی رازین و کەسمان سەرپێچی لەفەرمانەکانت ناکەین. ئیبن بەتوتە لای کردەوە بەلای بەیدەباو پێی ووت : خزمەتکارەکەت لەگەڵدا ئەنێرم بۆ بەرێکردنی ئاهەنگی ئەم شەو و زەماوەندی ئەو دوو لاوە بۆ ئەو دوو کچە بەویستی خوای گەورە. ئاهەنگەکە لەماڵی منداو لەسەر خوانی خۆم بەڕێ دەخرێت: مامۆستای (مارە بڕین) لەگەڵ خۆتدا بهێنە و بانگهێشتی کەس‌وکارو دۆستان بکەو هەرکەسێکیش بەحەزی خۆت لە دراوسێ‌و خەڵکی گەڕەك. من‌و تۆش ئەبینە شایەت لەم ژن هێنانە پیرۆزەدا. لە بیریشت نەچێ ئەی بەیدەبا تیپی ئاهەنگ‌و تەپڵ‌و سرودو شادی ئامادە بکە بۆئەوەی بەئیزنی خوا شەوێکی خۆش‌و شاد دەربچێت و چاو پێکەوتنە کانمانی پێ کۆتای بهێنین. ئەمەوێ بەئاهەنگی ئەم شەو پاداشتی خۆڕاگری خۆت‌و هاوەڵەکانت بدەمەوە کەچۆن بایەختان ئەدا بە بیرو لێکۆڵینەوەو ئاخاوتنەکان لە ماوەی شەوان‌و رۆژانی رابردوودا کە ئێوە باشترین قسەکەرو باشترین گوێگر بوون.پاش ئەوە پاشان مامۆستا پەڕەیەکی خستە ناو دەستی بەیدەبا کە بریتی بوو لە کۆپلەیەك ووتە و هۆنراوە کەدەربڕینی هەستی شادی و کامەرانی بوو لە لایەن مامۆستاوە بەم بۆنە خۆشەوە هەروەها باشترین هیواو ئاواتی پێشکەش بە بوك‌و زاواکان کردو داوای خۆشی‌و خۆشگوزەرانی و بەختەوەری بۆ کردن شێخ ئیبن بەتوتە رووی کردە بەیدەباو وتی: ئەی بەیدەبا ئەوەی کەنوسیومە لەو پارچە کاغەزەدا بیدە بە باشترین ئاهنگساز لە شارەکەتاندا بۆ ئەوەی ئاوازێکی شیاوی بۆدانێت و لاوەکانمان لەزەماوەندەکەدا بیڵێنەوە و بۆ زەماوەندی دوای ئەوانیش بەئیزنی خوا. بەیدەبا بە پێکەنینەوە وتی: مامۆستا گیان هەروائەکەم بە ئیزنی خوا سرودی خۆشی‌و شادی ئەبیستیت کەگوێت بەئاوازی ناسك‌و وشەی جوان رۆشن ئەبێتەوە. لەشەودا هەموو کەسوکارو دۆست‌و هاوڕێیان و خەڵکی گەڕەك لەپیرو

لاو و ژنو پیاو کۆبوونەوە لەجوانترین خشڵو جلو بەرگی نەتەوەیی داپۆشراویاندا بوون وەبەجوانترین رەنگو ئالاو والاوە دەرکەوتن کەشیاوی لەشولاری ریكو روخسارە جوانەکەیان بوو : هەروەکو ئەستێرە ئەدرەو شانەوە لە ئاسمانی سافدا. وەئەوەی کە زیاتر ئەم گەنجانەی جوان کردبوو، گەورەترین هەستو سۆزی مرۆڤایەتی لە خۆشەویستیو ئولفەتو هۆگری لە دڵدا دروست دەکرد، ئەوە بوو دور بوون لە دەرخستنی عەورەتو شوێنە سەرنج راکێشەکانی لەشیان کەهیچ پێویستی نییە بەدەرخستنیان لەم کۆمەلگا بەرزو رەوشت بەرزو شارستانیەدا بە راستی کە لە شانی یەك خێزاندایە نەك وەك لەوەرگایەکی مەباح کە تیایدا بانگهێشتی ئاژەلانەو خۆپیشاندان و لەش بەرووتی دەرئەکەوێت بەمەبەست بێ، یان بێ مەبەست و وروژاندنی حەزو ئارەزووی ئاژەڵی و لادان و بێ رەوشتی دەبینرێت لەبەر ئەوە تۆ لە کۆمەڵگایەکی ئاوا بەرزدا کچانو ئافرەتانی لە ناو جلو بەرگی داپۆشراو و تێرو تەواودا دەبینیت کە تەنیا روخساری رۆشنو دەستیان دەبینرێ، چونکە دەستی مرۆڤ ئامێری هەڵسو کەوتێتیو دەموچاویشی بیتییە لەکەسایەتیو ئیرادەی هەروەها مافی پیرۆزێتی کەراست نییە داپۆشینیو کوێرکردنەوەی و زوڵم لێکردنی. لەبەر ئەوەی بەند کردنو داپۆشینی رووی پێویستە بەشی لادەرو تاوانبار بێت نەك قوربانیەکی خاوێن. تیپی گەنجەکان بەز روزیوو هەنگاوی شادیەوە بلاوبوونەوە و ئامادەییان وەرگرت بۆ ووتنی سرودو گۆرانی بەجوانترین ئاوازو بەزم،و گۆرەپانە فراوانەکەیان پر کردەوە لەبەردەم ماڵەکەداو بوون بەدوو ریز لە بەرامبەری یەکدا ریزی کچانو ریزی کوران بۆ هەڵپەرکێی میللی لەو چەشنەی کە خەڵکی شام پێی دەڵێن (دەبکە) و تایبەتە بە ئاهەنگی شاییو کە بریتییە لە دەربرینی هەستی خۆشەویستیو رێزو ماناکانی بوێریو ئازایەتیو لەوچەشنە هەڵپەرکێیەدا ریزەکان لەیەك نزیك دەبوونەوە پاشان بەپێی ئاوازەکان لەیەك دوور ئەکەوتنەوە. ئینجا بازنەیەك لە کورانو بازنەیەك لە کچان دوا بەدوای یەك دروست دەبوون. دیسان دەبوونەوە بە ریزوو ئەڵقەیان دروست دەکردەوە دوور لەیەك بۆ ئەوەی یاساکانی تێکەڵاوی بپارێزن لەهەمان کاتیشدا پری بوو لە سەربەستیو جوانی. ئینجا بازنەیەکیان دەوری ئەوی تری ئەدا پاشان ئەبوونە یەك بازنەی گەورە لایەك بۆ کورانو لایەك بۆ کچان دوای ئەوە ئەبوونەوە بە دوو ریزی بەرامبەر بەیەك هەر بەو شێوەیە تانیوەی شەو لە خۆشیو گۆرانیو ئاوازو شادیدا بوون لەگەڵ شەرمو نازی کچی داوێن پاك پاشان خاوەن دەفەکان چوون بەرەو پێشوازی بوكو زاواکان کە لەتەواوی جوانیو شێوەدا بوون وێنەی مانگ لە شەوی بەدرا بەشەرمو

درەخشانو روخساری گەش خۆشی لە چاویان ئەباری رومەتەکانیانی پێ بریقەدار کردبوو. هەموان لە کورو کچی گەنج بوون بە دوو ریزەوە سرودی پێشوازیان دەووت بۆ بوكو زاوا ئەو سرودە کە لەپورییەی کە بۆ بەخێر هاتنی پێغەمبەر ووترا جوانترین درودو سەلامی لەسەر بێت کاتێك تەشریفی هات بۆ مەدینە بۆ ئەوەی گرنگی ئیسلام هەڵبکاتو لە ئاسمانی مرۆڤایەتیدا خۆرەکەی بدرەوشێتەوە، لەدەربڕینی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خواو فەرو پیرۆزی بەم بۆنە خۆشەوە ئەیان ووت:

ئەوا مانگ لەسەرمان هەڵهات

لای (ثنيات الوداع)ەوە هات

پێویستە سوپاسگوزاری بین

هەتا بانگخواز هەبێت بۆ لای خوا

ئەی ئەو کەسەی نێر راوی بۆناومان

بەفەرمانی بەجێ هاتووی بۆ لامان

بوكو زاواکان لەسەر کورسی تایبەتی خۆیان دانران هەتا تیپی دەفو سرود بێژەکان هاتنە بەردەمی بوكو زاواکانو ناوەڕاستی مەجلیسەکەوە بەلەرەی دەنگو ئاوازی خۆشو زوڵاڵیان سروودەکەی شێخ ئیبن بەتوتەیان ئەوتەوە کە خۆیی‌و بەیدەباو خزمو کەسوکار دەورەیان دابوون، لەدوای تەواو بوونی سرودەکە هەموو بەیەك دەنگ سەڵاواتیاندا لەسەر پێغەمبەر ﷺ: **أللهم صلّ وسلم وبارك عليه**، دوای تەواوبوونی بەزمو سرود، ئیبن بەتوتەو بەیدەباو کەسو کاری بوكو زاواکانو هەموو بانگ کراوان هەستانەوە بۆ سەر سفرەو خوانی ئامادە کراوو رازاوە کە بەیدەبا خۆی هەڵبژاردبوو بۆ ئەوەی شەوێکی زۆر بەتامو خۆش دەرچێت بۆ هەموو دۆستو خۆشەویستان. بەیدەبا وتی: شەوێك بوو هیچ کەسێك لە ئامادە بوان لە بیری ناچێتەوە، کە شادیمان زیادی کرد خۆشەویستیمان بۆ مامۆستای گەورە چەند قات بویەوە کە سەفەری ماڵ ئاواییەکەی قوڵترین کاریگەری هەبوو لە دەروناندا و ئێشی گەیاند بە دڵمان بەڵام هێشتا جێگای لەنێو دڵەکانمادا هەرماوە بە باشترین یادەوەری‌لە خۆشەویستی گەورەییەتی. بەیدەبا دەڵێت: بەمە چیرۆکی ئێمە لەگەڵ پیری گەرۆکی دانا ئیبن بەتوتە تەواو بوو وە من ئومێدەوارم ئەو هەوڵو کۆششەی بەکارم هێنا بۆ نووسینەوەی‌و بەچیرۆك کردنی توانیبێتم وەفام کردبێت بە پەیمانەکەم بۆ مامۆستای پایەبەرز، هەروەها توانی بێتم ئاسانکاریم تیا کردبێت بۆ سود وەرگرتن لە زانستو حیکمەتو ئەزمونەکانی بۆ

هەر کەسێك ئەی خوێنێتەوەو دوای ئێمەش لەنەوەکانی داهاتوو. بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات لە روونکردنەوەی بینشو بیرو بۆچوونیان وە بەهەوڵو کۆششو داهێنان بگەنە ئامانجی مەرامی خێرو چاکە لە پێناوی رزگاریو چاکخوازیداو هەروەها ئاشتیو ئاسایشو بنیات نانی ئەو شتانەی کە خوای گەورە فەرمانیداوەبۆ ئادەمیزاد لە جوانیەکانی شارستانیو ئاوەدانی وە سودمەند بوونو بەهرەمەند بوون بەباشە حەڵاڵەکان بەئیزنی پەروەردگار.

# گەشت بەرەو باشور

ساتەکانی سەفەر نزیك بوونەوە، هەوا ئارام بوو، ئاسۆ رەنگی زەرد هەڵبڕزکاو بوو، چاوی خۆر سور هەڵگەڕابوو ماڵئاوایی کەران هەموو راوەستابوون بۆ دووایین جار چاویان بڕیبووە مامۆستای گەورەیان وەکاتێك سواری کەشتی سەفەرەکەی بوو دەستەکانیان هەڵئەبڕیو خوا حافیزیان لیێ ئەکردو شەپۆلەکان ووردە ووردە دووریان ئەخستەوە. خوێنەری خۆشەویست: بەم شێوەیە مامۆستا هاوەڵەکانی بەجێ هێشت بەرەو سەرزەمینی باشور کە هەموویان خۆشەویستی بوونو دڵ گران بوون بەجیا بوونەوەی، گرنگ ئەوەیە لە کۆتایی ئەم چیرۆکە کە پڕە لە پەندو دەرسو عیبرەت لە لایەن سەرچاوەکانی ئەم نوسینەوە پیری گەڕۆك کەشتو نخونیو سەفەر زۆری بۆ هێنابووە، خوێنەری بەرێز بزانیت لەدوای ئەوەی کە سەردانی دورگەی بیناسازانمان کردو بەچاوی خۆمان دۆڵە سەوزەلانە جوانەکەیانمان دی راستی قسەکانی مامۆستای پایەبەرزی گەڕۆك ئیبن بەتوتەمان بۆ دەرکەوت دەربارەی خەڵکی دورگەی بیناسازانو دۆڵە سەرنج راکێشەکەیانو هاولاتیانی دڵسۆزو باوەڕدار.بە ئامانجی گەورەو بینشو بیرو بۆچوونی رووناکیانو پاکو سەرکەوتوویی لە بەرنامەی فیکریانداو دروستکردنی ویژدانیان هەروەها دڵسۆزی بەرامبەر کارەکانیانو داهێنان تیایدا، بەتەواوی توانیویانە ولاتەکەیان ئاوەدان بکەنەوەو داهاتەکانیان بەکار بهێنن جوانیو سەمەرەکانی دەربخەن لەبەر ئەوە کۆمەڵگاکەیان رێكو توندو تۆڵ راگرتووە، هەر شەش دەسەلاتەکەیان بەرپا کردووە. حکومەتو دەولەتەکەیان دروستو یاسا رێژ کردووە وە توانیویانە دوژمن لە خاکەکەیان دەربکەن: بۆ ئەوەی لەخۆشەویستیو هاوکاری یەکدابن. لەگەشە سەندنو خۆشگوزەرانیو هێمنیو ئاشتیدابن. پێشینانیش ووتویانە(ئەوەی هەولێ بۆ بدات دەستی دەکەوێت) و (چی بچێنیت هەر ئەوە دەدورێتەوە)و یان"ئەوەی لە دەروازەوە بڕوات هەر ئەگات" بەم ئاکامە خۆشە بەرێزان چیرۆکەکەی بەیدەبای دانا کۆتایی پێ هات دەربارەی دورگەی بیناسازانو کارو باری دانیشتوانەکەی کە چۆن بەهاوکاریو هاودەمیو پشتیوانی یەکتریو راوێژو دڵسۆزی حاڵی خۆیان گۆڕی بۆ باشترین حاڵ. هەموو ئەمانەو زۆر بەووردیو گرنگیەوە نوسراوەتەوەو کۆکراونەتەوە لەناو چیرۆکی وونکراو لە ریوایەتەکانی سەرگوزەشتەی کە لەپوری بەناو بانگ (کلیلەو دمنە). لەبەر ئەوە خوێنەری ئازیز، بەڵکو ئێمەش سوود وەربگرین لەوەی تیایدا هاتووە هەروەکو مەبەستیش لەنوسینی ئامۆژگاریو پەندو

پێشنیارەکانی بۆ تێگەیشتنە لەمانای ژیانمان و بینای سیستەم و پاراستنی ئاسایشی وڵات و هێنانە ژێر بارو بەکارهێنانی بەروبومو داهاتەکانمان بۆپڕکردنەوەی پیویستییەکان وهەروەها پاراستنی ریزو مرۆڤایەتیمانوئاوەدانکردنەوەی جیهانەکەمان. وەئەرکی سەرشانمانە سوپاس گوزاریو پیزانینیی خۆمان دەربڕین بۆ فەیلەسوفی گەورەمان بەیدەباو مامۆستای پایە بەرزی گەڕۆك **(ابن بطوطة)** کە هەرچی ئامۆژگاریو ئاگادارکردنەوەو پێشنیارو روونکردنەوەیان هەیە بۆ ئاسانو ساکار کردووینەتەوە. گریمان تۆش خوێنەری بڕێز بیر لەگەشت دەکەیتەوە بەرەو رۆژهەلاتو رۆژئاوا، بەرەو باکورو باشور بگەیتە ئەو دەریاو ئۆقیانوسەوە بەرەو ئاسۆی فراوانی دوور. پشت هێڵی شەبەقی سور، شوێنی هەڵهاتنی مانگ، لەو دوورگە جوانە رازاوەدا دابەزیت : بێ گومان چەند رۆژانێکی خۆشو بەتام لەو دۆڵە سەوزەلانە دلگیرەدا دەبەیتە سەر لای خەڵكو دانیشتوانێکی بەهێزو ئیش کەرو پاكو ئاشتی خواز. وەلەگەڵیاندا بەهرەمەند ئەبیت بەنیعمەتە چاكو بەلەزەتەکان بێ ئەوەی هیچ کەسێك خۆشیەکانت لێ تێك بدات و بەیادگاریو دیاری جوانو بەنرخەوە لە وڵاتە رازاوەکەیان دەگەڕێیتەوە.

خوێنەری ئازیز: لەکۆتایی ئەم چیروکەداو پاش ئەوەی بەهرەمەند بووی بە پەندو دانایەکانی بەیدەبای فەیلەسوف و مامۆستای پەندیاری گەڕیدە ئیبن بەتوتە، داوای پاشەڕۆژێکی کامەرانو ژیانێکی پرشنگدار و بەرهەمدار ئەکەین بۆت هەروەها کۆمەڵگایەکی کارامەو هاوکار و رێك تەباو ئوممەتێکی ئیسلامی سەربەستی بەتوانا بەئیزنی خوا.

## پاشكۆی روونكردنەوەی یەكەم

پێناسەی قورئانی: (**امة یدعون الی الخیر**) قورئانی پیرۆز زۆر لەواتاو چەمكی پێشكەش مرۆڤایەتی كردووە كەپێویستە سیستەمو دەزگا كۆمەڵایەتیەكانی لەسەر دروست بكرێت بەڵام چۆنیەتی هێنانەدی و شێوازی جێ بەجێكردنی بۆ خەڵكی جی هێشتووە كەبەپێی پێویستیو گۆڕانكاری كاتو شوێن وەهەروەها بەپێی فراوان بوونی زانستو زانیاری و گەشەسەندنی شارستنی مرۆڤوتواناو پێشكەوتنەكانی دەگونجێنرێت وەلەدیارترین ئەو بیرۆكەو چەمكانەی كەبیرمەندانی ئەم ئوممەتە ماوەیەكی دووریش نابێت پێی ئاگادار بوونەتەوە وەكو دەزگایەكی رامیاری كۆمەڵایەتی گرنگ پشت گوێ خراوە لەڕابردووشدا بەشێوەیەكی راستەقینە گەشەی نەكردووە ئەو دامەزراوەش خۆی لەقاڵبی شورا (**مفهوم الشورا**) دەبینێتەوە.لەبەر ئەوە سەرنجتان رادەكێشین بۆگرنگی خوێندنەوەی قورئانو بەروانگەیەكی تازەوە و ئاگادار بوونەوە بەلای ژمارەیەك لەچەمكی پێویست بۆدروستكردنی یاسای كۆمەڵایەتی ئیسلامی هاوچەرخ بەشێوەیەكی كارامەو پەسەند ئەوانەی رۆشنبیرو بیرمەندە موسوڵمانەكان هەتا ئەمرۆش بەشێوەیەكی گونجاو سەرنجیان نەداوەتێ. هۆی ئەوەش هەتا سنورێكی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ ژمارەی رۆڵەكانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت لەلایەك بەسیفەتی پێغەمبەرایەتی و گەیەنەرو وەحی بۆسەر دادەبەزێ هەروەها رۆڵی بانگخوازو مامۆستا، بوونی وەك سەرۆكی دەوڵەت و دروستكەری كۆمەڵگا ئەم رۆڵانە كە ئەبوایە موسوڵمانان لەدوای كۆچی دوایی پێغەمبەر لەیەكیان جیابكردنایەتەوە یەك بەیەك رۆڵی پێغەمبەرایەتی و گەیاندنی پەیامەكەی بەكۆچی دوایی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت كۆتایی پێهات، بەڵام شیعەو سۆنیەكان كاریان كردووە لەسەر بەردەوام بوونی ئەم رۆڵە لەشێوەی ئیلهام و كەراماتی ئەولیاو بێ گوناهان. هەروەها رۆڵی پێغەمبەر ﷺ وەك بانگخوازو مامۆستا پێویستە لەڕۆڵی سەرۆكی حوكمەتو بەرنامەكەیو بەرنامەكانی فەرمنڕەوایی سیاسیو ئەوانەی تەمسیلیان دەكەن لەهێزو جۆرەها بەرژەوەندی لەیەك جیا بكرێنەوە بۆئەوەی ئاینو شتە پیرۆزەكان بەكارنەهێنرێت بۆ خزمەتی بەرژەوەندی سیاسی كەئەبێتە هۆی بەكارهێنانی ئایین بۆ سیاسەت و جێگیر كردنی فەرمانڕوایەتی دكتاتۆری. كەواتە سەربەخۆیی رۆڵی بانگەوازو فێركردن و گەڕاندنەوەی بۆ ژێر دەستی نەتەوە كەتوانای بدرێتێ رۆڵی ئازادانەی هەبێت لە دروستكردنی ناخو كەسایەتی موسوڵمان.

ئەوکاتە ئوممەتی موسوڵمان ئەبێتە هۆکاری هۆشیا کردنەوەو چەسپاندنی ڕۆڵی ئایینو نەریتی بەرزو پاراستنی مافەکانی گەل، وائەکات لەم ئوممەتە ئیسلامیە ببێتە راسپێر راو بەسەر کاربەدەستەکانیەوە و دیاری کردنی ڕێڕەوی جێ بەجێکردنو بەرنامەی سیاسیان.
لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین ئەو نەبزاوتنو مت بوونە نسبی یەی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت وای لەزانایانو بیر مەندان کرد لەگەڵ ئەو لاوازە فیکرییەی توشیان هات بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لەژیانی گشتی زیاتر بە شوێن سونەتەکانی پێغەمبەر بن ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بەکاتو شوێنەوە زۆر زیاتر لە لێکۆڵینەوە و گەڕان بەشوێن چەمکی قورئانی بێ شوێنو کاتەکان بۆ رووبەڕو بوونەوەی گۆڕانکاریەکانی بەپێی کاتو شوێن و هێنانە دی مەبەستەکانی شەریعەت. لەم سەرچاوەوە حەز ئەکەین سەرنجتان ڕاکێشین بۆلای دوو ئایەتی پیرۆز کەپەیوەندیان هەیە بەچەمکی بانگەوازو فێرکردنی ئایینی.
وەك دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتی پەروەدەی گرنگ کەپێویستە لەسەر ئوممەت وەکو دەزگایەکی سەربەخۆ دروستی بکاتو هەموو گرانتییەکی سەربەخۆی پێ بدرێت و یەکسان بێت لەگەڵ دامەزراوەکانی وەك دەستورو راوێژ کاری وردا لەگەڵ باقی تری دامەزراوەکانی یاسای کۆمەلایەتییە ئەساسییەکان هەتاوەکو ئەوانە بمێنێتەوە و ڕۆڵی کارامەی خۆی ببینێت لە بانگەوازو پەروەردەو فێر کردنی ئایینیو خوڕەوشت کە دووربێت لەئافاتەکانی دوور خستنەوەو تێکەڵو پێکەڵ کردنی بەهەر کامێکیان بێت، ئەویش بە پووچەڵکردنەوەی و گۆڕینی چەمكو واتای دینو بانگەواز و فێرکردنی ئایینی بۆ تەنیا دروشمێکی بێ ناوەڕۆك و وشك کە بۆنەکانو ئاهەنگی لەدایکبوونی پێ بەریتە سەر، یان بەکار بهێنرێت بۆ کاری لایەنگریو فەتوادان بە نەفعی خاوەن دەسەلاتەکان و جەنگە رامیارییەکانیان، یاخود بە چەواشەکردنو قۆستنەوەی ئایین ئەویش بە بەکارهێنانی ئایین و پیرۆزیەکانی لە لایەن پیاوانی سیاسەتمەدارو خاوەن بەرژەوەندی تایبەت. هەروەها بەکار هێنانی دین وەکو هۆیەك بۆ بلاوکردنەوەی ترسو تۆقاندنو دەم بەس و پوچەڵ کردنەوەی ژیری لەپێناوی خزمەتی دەسەلاتو ڕامیارییەکانی و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان، بەلام ئەم دوو ئایەتە یا پێناسە قورئانیانە کەخوای گەورە دەفەرمویت : (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (آل عمران : ١٠٤ ) هەروەها ئەفەرموێ: (وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ) (التوبة : ١٢٢ ) لێرەدا وشەی

(**الاقة**) واته کۆمەڵو تاقم یا لیژنە، یان دامەزراوەیەکی سەربەخۆ، کە ئومەت خۆی سەرۆکایەتی هەڵئەبژێریێت بۆ ئەوەی دامەزراوەیەك بێت گرنگی بەکارو بارەکانی بدات، بەبێ هیچ کار تێکردنێکی دەسەلاٌتو بەرژەوەندییەك، جگە لەمتمانەی گەلەکەیو پشتگیریو چاودێری ئەوان نەبێت، هەروەها حەز دەکەین سەرنجتان رابکێشن کە لە وێدا ژمارەیەك چەمکی قورئانی تر هەیە کەپێویستە ئاگاداربینو گرنگیان پێ بدرێت بەویستی خوای گەورە ئەبێتە جێگای باسولێکۆلینەوە لەدەرفەتێکی تردا،ئەوەی گرنگە ئێستا ئاماژەی بۆ بکەین دوو ئایەتی ترە لە قورئانی پیرۆز کەپێویستە بابەتی توێژینەوەی زانستیو جێگای گرنگی پێدان بێت. بۆ ئەوەی ببنە بنەمای یاساکانی خێزانوچەسپاندنیان لەبەر رۆشنایی بەرەنگاریو پێشکەوتنەکانی سەردەم. کە پێویستە بەشێوەیەکی بەکارو راستەقینە چاو بگێڕینەوە بەسەر واتاو مەبەستەکانیدا بۆ پەیوەندییەکانی خێزانو پارێزگاری کردنی. ئەو دوو برگە قورئانیەش: (**إمساك بمعروف**) **یان** (**تسریح باحسان**) هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (**طلاق)دا** دەفەرمووێ: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ) (الطلاق : ٢ ) لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) (البقرة : ٢٢٩ ) هەرچەندە زانایانی سەلەفی ئاگاداربوون لە ژمارەو رۆڵی هەمە لایەنەی پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت لە ژیانی پێغەمبەرایەتیدا بەتایبەتی رۆڵی لە پەیامو گەیاندندا و رۆڵی بانگەواز و رۆڵی حوکمو فەرمانڕەوایی، بەلاٌم ئەو بارودۆخە بەپەلانەی ئەهاتنە پێشەوە و ئەو کە لە پورانەی ریشکیان داکوتابوو بەرژەوەندی دەست ڕۆیشتووەکانو ئەو بە سەرهاتانەی کەبە یاسای کۆمەلاٌیەتی لەسەردەمی یەکەمدا هات لەڕوخانی نیزامی خەلافەتی راشیدین و زاڵ بوونی بیرو بۆچوونی یاسای هۆزایەتی بەدوای ئەوانیشدا تێکەڵ بوونی رۆشن بیری دەوڵەتۆکەو نەتەوەکان کەهاتنە ناو ئیسلامەوە. بەرژەوەندی پیاوانی دەسەلاٌتو هاوکارە کانیان بەپاڵ ئەوەشدا دوور خستنەوەی پیاوانی قوتابخانەکەی مەدینەو زانایانی هەروەها لەلایەك دوور خستنەوەی چەمكو مەبەستەکانی ئایینی لەژیان رامیاریو وەلەبەر نەگۆڕانی سروشتی ئەو دەمە بەشێوەیەکی سەرەکی بۆماوەیەکی دوور و درێژ لەلایەکی ترەوە ئەمانە هەموو بوونە هۆی لە قاڵبدانی بیری زانایانو بیرمەندانو وایلێکردن کە مەیلیان هەبێت بۆ تەقلیدو لاسایی کردنەوە و پشت بەستن بەو جێیە جێکردنە شەرعیانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا دەکرا زیاتر لەوەی پشت ببەستن بەو دەقو چەمکە قورئانیانەو مەبەستەکانی کەنەبەسراوە بەشوێنو کاتەوە بەو

شێوەیەی کەگونجاو بێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکانو ئاسەوارە کۆمەڵایەتیەکان. کەئەم دیاردەیەش لەهزری ئیسلامیدا ناسراوە بەدیاردەی لاسایی کردنەوە (تقلید) و داخستنی دەرگای ئیجتیهاد. هەرچی پیرۆزی دەقەکانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت و کە لە پور کرایە بەهانە بۆ ئەم کارە. پێویستە ئاماژەی پێ بکەین کەسەرکەوتنی سەردەمی هەردوو جێنشینی ئەبوبەکری صدیقو عومەر کوڕی خەتاب و سەرەتای سەردەمی خەلیفە عوسمانیش ـ رەزای خوایان لێ بێت ـ هەرچەندە رۆڵی بانگەوازو پەروەردەو فێرکردن جیا نەبوو لەرۆڵی دەسەڵاتو فەرمان رەوایی ئەوەبوو ئەو سەردەمانە پیاوانی دەسەڵاتو حوکمڕانی هەر بەوشێوەیەی سەردەمی پێغەمبەر مابوونەوە، بەڵام زەمان تێپەڕیو مردنی زۆرینەی ئەو پیاوانە و شەهید بوونیان و بەساڵا چونیان لەگەڵ گۆڕانی کارو باری خەڵکی و زەمان دوای فراوان بوونی دەوڵەتو درێژە کێشانی فتوحاتو گەلانێکی زۆر هاتنە ناو دەوڵەتو ئیسلامەوە لەبەر ئەوە گۆڕانکاری زۆرهات بەسەر کەسایەتیو رۆڵەکانیان کەواتە مەرج بوو هەندێ ئاسەواری خراپیش دەرکەوێ لەدەسەڵاتو کارو باری دەوڵەت ئەو کێشانەش کەڕوویدا بەنەمانی سەردەمی خەلافەتی راشدی کۆتایی پێهات و کەم کەمیش جێگرتنەوەی نیزامی هۆزایەتی و نەتەوایەتیو دکتاتۆریو پاشایەتی. لەم زەمانەدا کە لەزۆر رووەوە دوورین سەبارەت بە بارو دۆخی مرۆڤایەتی لەسەردەمە پێشووەکاندا لەگەڵ پەرەسەندنی هێرشی فیکری رۆژ ئاوا بەتۆڕو کەناڵە ئاسمانیەکانەوە بەدەسەڵاتی زانستیو تەکنۆلۆژیاو ئابوریو رامیاریو شوێنەواری خراپیان لەسەر گەلو نەتەوە هەموو ئەمانە دوپاتی ئەرکی پێداچونەوەی فیکری ئیسلامییە بەگشتیو رامیاری بەتایبەت هەروەها پێداچونەوەی بەرنامەی ژیان ئەویش بەگەڕانەوە بۆ واتاو مەبەستو چەمکی قورئانی هاوکات لەگەڵ گەشە سەندنی شارستانی مرۆڤایەتیو تواناو بەرەنگارییەکانی : بەشێوەیەك خاڵە نەگۆڕەکان و مەبەستو بۆچوونیان رۆشنو دیاری بکرێت و لەگەڵ خاڵە ناجێگیرەکاندا تێکەڵ نەکرێن لەئیسلامدا ئەویش بەمەبەستی بەدی هێنانی ئامانجو هیدایەتی قورئان بەپێی کاتو شوێن و گۆڕانکاریەکان. لەم رووەوە گرنگە تێ بگەین کەدامەزراوەکانی پەروەردەی ئاینیو مژدە دەرەکانی وەك پەرستگاو کەنیسە لەوانەیە کاریگەری و ئاسەواری زیاتریان بووایە ئەگەر سروشتی ئەم دیانەتانە نەبەسرایەتەوە بەکاتو شوێنەوە وە تووشی دەسکاریو لادان و خورافیات یەکسەر نەدە بوو ـ لەکاتێکدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات بۆ ڕاستکردنەوەیو بۆ فەراهەمکردنی پێداویستی مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەمێکدا، ئیسلام

که دواین پەیامی خواییە و تەواوکەری ئاینەکانی ترە بە تایبەتی لە کاتێکدا خوای گەورە قورئانی پاراستووە کە سەرچاوەی سەرەکیو یەکەمە بۆ ئەم ئایینە. هەروەکو بە هەوڵو کۆششی زانایان سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بە سەنەدو دەقەوە پارێزران لە نەخۆشی لادانو دەستکاریو هەڵبەستن، هەموو ئەمانە وایکردووە کە دروستکردنی دامەزراوەکانی بانگەوازو پەروەردەی ئیسلامی سەربەخۆو جیابن لەدامو دەزگای دەسەڵاتو فەرمانڕەوایەتی وەك پێویستییەکی گەورەو هۆکارێکی گرنگ بن بۆ دەست بەسەرا گرتنی گەندەڵیو دکتاتۆری بۆ راپەڕینی میللەتو چاکسازی لەبیرو بۆچوونو پەروەردەیدا دوور لەهەر کایگەرییەکی خراپ هەروەکو پێویستە مزگەوت ناو جەرگەی دامو دەزگای بانگەواز بێتو پێویستە بەرنامەکانی بانگەوازو فێر بوونو پەروەردەی ئایینی کۆمەڵایەتی تایبەت بێت بەمزگەوتو دامەزراوەی ئایینیيەوە. کەنابێت دەسەڵاتی جێبەجێکردن **(السلطة التنفيذيه)** لە دەوڵەتدا دەسەڵاتی هەبێت بەسەریدا یا فەرمنڕەوایی تیا بکات. بەشێوەیەك نابێت هیچ سانسۆرو چاودێرێك هەبێت بەسەر ئەم دامەزراوانەدا چ گشتیو چ تایبەتی و بەسەرئامرازو چالاکیەکانیدا جگە لە چاودێری میللەتو نوێنەرەکانی نەبێت کە بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژێراون. ئەوکاتە میللەت بیرو بۆچوونو روانگەی راستو پاڵفتە دەبێت. زۆرداریو گەندەڵی ریشە کێش دەبنو فەرمان ڕەواییو ژیانی گشتی لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا بەباشی بنیات ئەنرێن. ئوممەت دەبێتە بەرپرسو خاوەنی فەرمانو تەوجیهات لەسەر دامو دەزگای دەوڵەت نەك پیاوانی دەسەڵاتو بەرژەوەندیو رامیارییەکان. بابزانین حاڵی ئەم ئوممەتە سەربەرەو خوار هەڵگەڕایەوە لەکاتێکدا نەتەوەی موسوڵمان بوون بەوانەی **(الذين لايعلمون والذين لايفقهون)** بە پێچەوانەشەوە پیاوانی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایەتیو فەرمانبەرەکانیان بوون بە **(الذين يعلمون** ويفقهون). میللەت بوو بەکەسێکی ناکامو ناتەواو، خاوەن بەرژەوەندیو کاربەدەستەکانیشیان بوونە زاناو بەرپرسو راسپێراو، لەکاتێکیشدا میللەت پێویستی بە هۆشیاری زیاتر بوو ئەوە لە رێگەی پەروەردەو فێرکردنەوە دەبێت نەك لەڕێگای راسپاردەیی. وە دواین تێ بینیم ئەوەیە فیکری ئیسلامیو رامیاری بەردەوام نەبێت لە تێکەڵ کردنی مەسەلەکان، ئەوەی کە پەیوەنی هەیە بە (دەسەڵاتی جێبەجێکردن)و دەسەڵاتی بەسەر ئایینو بانگەوازو فێرکردنی ئایینیدا. لێرەدا گرنگ ئەوەیە بزانین ئایا دورخستنەوەی دەسەڵاتو بەرژەوەندییەکانی لەسەر رۆڵی ئاینو بانگەوازو پەروەردەی ئاینی لە دەوڵەتو کۆمەڵگادا بەکارێکی باش دادەنرێ، یان خراپ؟ وە ئایا بریتییە لە جیا

کردنەوەی دین لە دەوڵەت؟ یان بریتییە لە وازهێنانی دەسەڵات لە لەکەدارکردنی ئایین ئەویش بە دوور خستنەوەو پەراوێزکردنی، یان بە قۆستنەوەی دینو بەکارهێنانی بۆ خزمەتیبەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتو فەرمانڕەواکان ئەمە مەسەلەیەکە زۆربەی کەس تێکەڵی ئەکەن. بۆیە گرنگە تێ بگەین جیاکردنەوەی بانگەوازو پەروەردەی دینی لە دەسەڵاتی جێ بەجێ کردنو بەرنامە رامیارییەکەیو بەرژەوەندی ئەو کەسانەی کە نوێنەری ئەو دەسەڵاتەن مانای جیاکردنەوەی ئایین نییە لە دەوڵەت، بەڵکو خزمەتێکە بەرامبەر گەلو دەوڵەتو پاراستنی بیرو باوەڕو ئایینو پیرۆزییەکانێتی لە دور خستنەوەیو لەکار خستنی یاخود بەکارهێنانی وەك دەستە مۆیەك لە خزمەتی پیاوانی دەسەڵاتو خزمەتی ئەو کۆمەڵانەی کە لایەنگری ئەوون، چونکە دەسەڵاتو فەرمانڕەوا بریتیی نیيە لە دەوڵەت، بەڵکو گەلو نەتەوە بناغەو گرنگترن لە پێکهێنانی دەوڵەتدا وە لە هەڵبژاردەی ئەوان شەرعیەت ئەدرێ بە فەرمانڕەواو کاربەدەستان. لێرەدا باس ئەوەیە کاری بانگەوازو پەروەردە بدرێت بە دەست میللەتەوە بۆ ئەوەی پەروەردەی رۆڵەکانیان بکەنو کادیرەکانی خۆیان ئامادەبکەن بەشێوەیەکی راستەقینە دور لە هەر کایگەرییەکو بەرژەوەندییەکی تایبەت. کەواتە ئەم رۆڵە ئەبێت بخرێتە پاڵ میللەت بۆ ئەوەی نەوەیەك پێ بگەیەنێت کە رۆڵی خۆیان ببینن‌و چاکسازی لە گشت لایەنەکانی ژیانو دامەزراوەکانیان بکەن لەوانە دامەزراوەی حوکمڕانیو دەسەڵات بە پێی ماناو چەمکی ئایینو رێبازو بەها باڵاکان کە خۆیانی لەسەر پەروەردە کراوەو بانگەوازی بۆ دەکەن. کەواتە بە کورتی جیاکردنەوەی ئایینو بەها پیرۆزەکان لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن بریتییە لە پاراستنی ئایین لە قۆستنەوەیو لەکەدارکردنیو لە دوور خستنەوەی هەروەها بریتییە لە بەدی هێنانی ئامانجەکانیو بەرز کردنەوەی پلەو پایەی لە نێو دەوڵەتو کۆمەڵگادا، وەدوور خستنەوەی ئایین لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن مانای دوورخستنەوەی نییە لە دەوڵەت، بەڵکو پەیداکردنی هێزو جێگیر بوونێتی لە دەوڵەتو کۆمەڵگادا. بە کورتی نیزامی نەتەوەو گەلە ئیسلامیەکان کە رەنگدانەوەی چەمكو مەبەستە ئیسلامیەکەیەتی، بریتییە لە نەتەوەیەکی ئیسلامی خاوەن دەوڵەتێکی شارستانی ئیسلامی، حکومەتێکی مەدەنیو سیستمێکی مەدەنی ئیسلامی، ئیسلام مۆركو ناوەڕۆکی ئوممەتە، مەدەنی بوونەکەشی بریتییە لە کۆمەڵێك هەڵو مەرج کە کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەسەری ریك دەکەون. نەتەوەکەی ئیسلامییە بە شناسنامەی هاوولاتیانی موسوڵمانیو پەروەردەو نەریتو چەمكو ئامانجو خواستو ئیرادەیان وە

دەوڵەتەکەشیان دەوڵەتێکە بە پێناسەو ناوەڕۆكو مەبەستی ئیسلامیەوە لە یاسایەکی دروستبووی ڕێك کەوتووکە بایەخ بە ناسنامەو بەرژەوەندی هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگا دەدات ـ موسوڵمانو غەیرە موسوڵمان ـ لە چوار چێوەی دەستورێکی مەدەنی خاوەن ڕێکخستنێکی ئیسلامی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتییەکەشی تەعبیرە لە مافە سەرەکیەکان کە مرۆڤایەتی لەسەری گونجاوون، هەروەها حکومەتێکی مەدەنییە کە پشت ئەبەستێ بە خواستو ویستی میللەتو ڕەوشتو بەها باڵاکانیانو بە هەموو چینو کۆمەڵێکەوە لەسەرو هەموویانەوە خواستو ئیرادەی کۆمەڵی موسوڵمان لە دەوڵەتدا. یاسایەکی مەدەنیشە، چونکە نوێنەرایەتی هەموو ناسنامەکان دەکات لەسەر ئەو بنەمایانەی کە دەستوری مەدەنی دیاری کردووە، پشت ئەبەستێ بە خواستو ویستی گەل کە چاودێرو ڕاسپێراوە بەسەر حکومەتو یاسا نەك بە پێچەوانەوە بەم شێوەیە بەگژاچوون نییە لە نێوان مەدەنییەتی سیستەمو ئیسلامیەتی نەتەوە هەروەها لە نێوان مەدەنیەتی حکومەتو ئیسلام بوونی دەوڵەت ئەوەی دەرئەنجام دەست دەکەوێت لەم دەوڵەتەدا ئازادی بیرو باوەڕو سەلامەتی فیکرو پەروەردەو هەڵبژاردنەکانە. میللەت چاودێرە بەسەر دەسەڵاتو فەرمانڕەوا بۆ ئەوەی کار بەدەستێکی متمانە پێکراوو پاسەوانێکی دڵسۆز بێت بۆ بەرژەوەندی گەل بەهەموو تاقمو بەشەکانیەوە، چونکە حکومەتی مەدەنی لە وڵاتی نەتەوەی ئیسلامیو دەوڵەتەکانی تەعبیر لە خواستو ویستی گەل دەکاتو بریکارێتی نەك تەعبیر لە خواستی پەروەردگار بکاتو بریکاری بنو بەو بەهانایەوە دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ بەسەر گەلدا. لەبەر ئەوەی لە وڵاتی ئوممەتی ئیسلامیدا شەرعیەت بۆ دەسەڵاتو فەرمانڕوایی نییە مەگەر هەڵقوڵاوی ناو گەلو نەتەوە نەبێت. هەروەها لەنێو کۆمەڵگای موسوڵمانو دەوڵەتی موسوڵماناندا بواری توندو تیژی نییە لە کێشەو ململانێی سیاسیدا، بەڵام لەکاتی پێویستدا گەل بۆی هەیە مومارەسەی نەیاریو سەرپێچی بکاتو بەرگری مەدەنیانە بکات بۆ چاکسازیو گەڕانەوەی دەسەڵاتو شەرعیەت، (چونکە باشترین جیهاد ووتنێکی ڕاستە لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار) و (گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروست کراوێك نییە ئەگەر سەر پێچی پەروەردگاری تێدابێت). بەم شێوەیە نەتەوەی ئیسلامی بریتییە لە پەروەردەوبانگەوازو فێرکردنە. بریتییە لە دەوڵەتو دەستورو حکومەتی شارستانی ئیسلامی، واتە بە مۆركو ناسنامە ئیسلامییە، مەدەنییە بەڕێکخستنو ڕێکەوتن لەسەری. بواری تێدانییە بۆ جیاکردنەوەو جیاوازی نێوان نەتەوەو گەلاندا ـ لە پەروەردەو بانگەوازدا ـ

وه له نێوان دینو بنهماو سیاسهتدا. بهمهش نهتهوهیهك، یان دهوڵهتو حكومهتێكی عهلمانی لیبرالی نییه كه ئاین تیایدا بزربێت، دهوڵهتو حكومهتێكی ماركسی نییه بهرهنگاری دین بكات، ههروهها دهوڵهتو حكومهتێك نییه ئاین تیایدا دوورهپهرێزبێتو تهنیا له بۆنهو جهژنهكانو رێورهسمی مردندا بیر كهوێتهوه، لهههمان كاتیشدا حكومهتێكی كههنوتی دكتاتۆر نییه كه ئاین بهكار بهێنێت بۆ بهرژهوهندییهكی تایبهتی، بهڵكو نهتهوهیهكی ئیسلامیه لهههمان كاتدا دهوڵهتو حكومهتێكی مهدهنی ئیسلامیه، پایهی ئاینو بنهماكان بهرز رادهگرێتو بیرو باوهڕو ئازادییهكان ئهپارێزێت دادپهروهری له نێوان خهڵكیدا بهرپا دهكات.

## پاشكۆی روونكردنەوەی دووەم

پێناسەو چەمكی یاسا: هەرێمایەتی یاسا، كەسایەتی یاسا

وەكو خوێنەر دەزانیت یاسا دوو جۆرە: یاسای دەوڵەت، یان هەرێم **(اقليمية القانون)** (state law) لەگەڵ یاسای كەسایەتی (Personal law ). یاسای دەوڵەت، یان هەرێم یاسایەكی ئەوروپییە لە ئەنجامی پێشكەوتنی كۆمەڵگای ئەوروپی دروست بوو كە كێشە ئاینییەكان رێ خۆشكەر بوون بۆ دروست بوونی ئەم یاسایانە بەتایبەتی لە نێوان كاتۆلیكە تەقلیدییەكان و پرۆتستانتە چاكسازەكانو هەروەها كێشەی رامیاری نێوان میرو سەرۆكەكان، كە ئەم كێشانە بە تەسلیم بوونی پاشاو میرەكانو سەپاندنی ئەو یاسایانەی دەری ئەكەن بەسەر دانیشتوانو هەموو میر نشینەكاندا بەبێ جیاوازی كۆتایی هات، بەپێی ئەو یاسایانە هەڵسو كەوت بكرێت لەگەڵیاندا دوور لە ویستو خواستی خۆیان بەبێ رەچاوكردنی لایەنگریو بارودۆخی كەسایەتیو تایبەتیان بەڵام یاسای كەسێتی**(شخصية القانون)** ئەو یاسایەیە كە بایەخ دەدات بەلایەنگریو خواستی تاكە كەسانی دەوڵەت و تایبەتمەندیو كەسایەتیان بەپێی توانا، كەواتە لەم نیزامەدا یاساكان دەگۆڕێن بەپێی جۆری لایەنو تایبەتمەندیو بەرژەوەندی ـ ئەگەر پێویستیو بەرژەوەند لەیەكبوونیدا نەبوو ـ لەبەر ئەوە بیرۆكەی یاسای كەسێتی بەمانا فراوانیەكەی زیاتر لەبارە لەگەڵ رێز مافەكانی مرۆڤو تایبەتیەكانی هەتا بیرۆكەی دەوڵەت، یان هەرێم. وەلە جیاوازییەكانی یاسای هەرێم بۆنمونە ئەبینین لەهەندێك لەو دەوڵەتانەدا ئەگەر كابرایەكی موسوڵمان لەبەر بەهانەیەك زیاتر لە ژنێكی بوو ئەوە بەدژی یاسای دەوڵەت ئەژمێرێو سزای بەسەرا ئەسەپێنرێت بەڵام لەكاتێكدا هەر ئەو كەسە یان یەكێكی تر دۆستێكی ژنی هەبێتوپەیوەندی نامەشروع لەنێوانیاندا هەبێت ئەوە بەدژایەتی یاسا ناژمێرێتو رووبە رووی سزا نابێتەوە. وەلە نوێترین دژواری یاسای هەرێم كەپێویستە لەسەر هاو وڵاتیان گوێرایەڵی بن لەهەموو كارو بارێكیاندا بەبێ رەچاوكردنی كەسایەتەیو تایبەتمەندی لەمەشدا زۆرجار پەل ئەكێشێت بۆ دەست درێژی كردنە سەر مافی كەس كەسەكەمایەتیەكان لە لایەن زۆرینەوە. نموونەی ئەوەی كە ئەوروپای دایكی ئازادییەكان دایهێناوە دەربارەی مافی دەرخستنی هەندێك هێما كەبەڵگە بێت بۆ ناسنامەو لایەنداری ئاینی بۆ وێنە لە مل كردن یان هەڵگرتنی خاچ قەبارەكەی بچوك بێت دروستە بلام لە هەمان كاتدا رێگە نادات ئافرەتێكی هاو وڵاتی باڵا پۆش بێت لەخوێندنگاو

دام‌و دەزگاكانی دەوڵەت، چونكە ئاماژە دەكات بەلایەنگرێتی‌و ناسنامەی ئیسلامی بەمەش ئەو یاسایە مافێكی ئایینی‌و مرۆڤایەتی لەسەر ئافرەتی هاو وڵاتی موسوڵمان‌و تاقم‌و كۆمەڵی تر جگە لە مەسیحی یاساغ دەكات كە لە راستیدا دەست درێژییە بۆسەر ئازادی كەسایەتی ئەویش بەنەهێشتنی لەبەر كردنی بەرگێك كەبە ئەركێكی ئایینی دائەنرێت و لایەنی رۆشنبیری‌و دینی ئەو كەسە دەرئەخات‌و مافێكی سروشتی مرۆڤەو زیان‌و نارەوایی نییە لەسە مافی كەس. كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەڵگرتنی هێمای مەسیحیەت بێ گومان ناسنامەی مەسیحی ئاشكرا دەكات‌و نوێنەرایەتی زۆرینەو كە لەپورە رۆشنبیری یەكەی دەكات. لێرەدا بپێچەوانەی یاسای هەرێم لە سایەی یاسای كەسایەتیدا (**شخصیة القانون**) هەر خاوەن رێبازو كۆمەڵێك ئەتوانێت مومارەسەی مافەكانی خۆی بكات بەرامبەر ئەو ئەركەی لە ئەستۆیدایە مادەم نەئەبووە هۆی زیان‌و دەست درێژی بۆ سەر مافی كەسانی تر. باش وایە ئاماژە بكەین كەگرنگترین شارستانی پابەندبێت بەچەمك‌و واتای كەسایەتی بریتییە لەشارستانی ئیسلامی لەبارەی رێزی مرۆڤایەتی مرۆڤ و مافی لەهەڵبژاردن‌و جیاوازی‌و جیاكاریدا هەروەها لەبەدی هێنانی رێبازی (داد پەروەری) كە گرگترین رێگایە ئیسلام گرتویەتە بەر لە هەڵسوكەوتی نێوان خەڵكی.وە دەوڵەتەكانی جێنشینی ئیسلامی و میرشینەكانی پابەند بوون بەو رێبازە كە لە دەوڵەتی عوسمانیدا دواین دەوڵەتی جێنشینی ئیسلامی ناسراو بووە بە (**نظام الملة**) یاسای میللەت. ئەوكاتەی مانای یاسای كەسایەتی نەبوو لەجیهانی شارستانی رۆژ ئاوا و دەوڵەتی نەتەوەیی كەچی هێشتا لەشوێنەوارە باشەكانی دەبینین لە دەوڵەتە فرە نەتەوەییەكانی جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی لەو یاسایانەی كە پەیوەندی هەیە بە شوێنكەوتوانی ئاینەكان‌و پێی ئەوترێ یاسای باری كەسێتی(**قوانین الا حوال الشخصیة**).

## نووسەر لەچەند دێڕێكدا

ـ أ. د.عبدالحميد أحمد أبو سليمان لەساڵی ١٩٣٦ز لە شاری مەككەی پیرۆز لەدایك بووە هەرلەوێدا قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندی تەواوكردووە.

ـ پاشان بڕوانامەی بەكالۆریوسو ماستەری لەزانستە رامیارییەكاندا لە ساڵی ١٩٦٣ز لە زانكۆی قاهیرە بە دەست هێناوە.

ـ هەروەها لە ساڵی ١٩٧٣ز پلەی دكتۆرای لە(پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكان) لە زانكۆی بنسلفانیای ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا بە دەست هێناوە.

ـ ماوەیەك سەرۆكی بەشی زانستە رامیارییەكان بووە لە زانكۆی مەلیك سعود لە ریاض.

ـ لە ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٩ز دامەزرێنەرو ئەمینداری گشتی یەكەم بووە بۆ نەدوەی جیهانی لاوانی ئیسلامی لە ریاض.

ـ دامەزرێنەری بزوتنەوەی خوێندكاران بووە لە كەنەداو ویلایەتە یەكگرتووەكان.

ـ لە ساڵی ١٩٨٨ـ ١٩٩٩ز بەڕێوەبەرو دامەزرێنەری زانكۆی ئیسلامی جیهانی بووە لە مالیزیا.

ـ ئێستاش دامەزرێنەرو سەرۆكی پەیمانگای جیهانییە بۆ فیكری ئیسلامی.

وەلە بڵاو كراوەكانی:

ـ نظرية الاسلام الاقتصادية ١٩٦٠م

ـ نظرية العلاقات الدوليه في الاسلام ١٩٧٣م

ـ أزمة العقل المسلم ١٩٨٦م

ـ العنف وادارة الصراع في الفكر الاسلامى ٢٠٠٢م

ـ ضرب المرأة وسيلة لحل الخلافات الزوجيه ! ٢٠٠١م

ـ الانسان بين شريعتين ٢٠٠٣م

ـ أزمة الارادة والوجدان المسلم ٢٠٠٤م

ئەم پەرتوکە

چیرۆکێکە روداوەکانی لەسەر زمانی (بەیدەبا)ی داناو فەیلەسوف ئەگێڕێتەوە، کە دادەنرێت بە درێژە پێدەری چیرۆکی (دورگەی بیناسازان)و مەبەست لێی خستنە رووی چەند بابەتو ووتو ویژێکی فیکرییە بۆ مرۆڤی هاوچەرخ کەبنە ماکانو بیرو بینشی ئەم نەتەوەیە لەبەر رۆشنایی روانگەی گشتی قورئانی دائەرێژێت لەگەڵ ئەو کارو جێ بە جێکردنانەی سەردەمی پێغەمبەرایەتیو ئەزمونەکانی ئومەتی ئیسلامی بەدرێژایی مێژووە دەوڵەمەندەکەی. وە بەشێوازێکی پەروەردەیی دەری ئەبڕێت کەفیکرو بیرو باوەڕ ئەکاتە واقعێکی کاریگەر لەسەر ژیانو رەفتارو دامو دەزگاکانمان لە فیکریو کۆمەڵایەتیو ئابوریو رامیاری. لەبەر ئەوە خوێندنەوەی سەر گوزەشتەی (گەنجینەکانی دورگەی بیناسازان) کارێکی پێویستە بۆ گەشە پێدانی هۆشیاری مرۆڤ بەگشتیو مرۆڤی موسوڵمان بەتایبەتی، بۆ پەی بردن لەو چەمكو بابەتانەی کەچیرۆکی (دورگەی بیناسازان) گرتویەتیە خۆیو سوودوەرگرتن لێی بە باشترین شێوە.

ئەم پەرتوکە لەم بابەتانەوە ئەدوێت:

١ـ پێویستە پەروەردەو فێرکردن جێی بایەخو گرنگی هەموو گەلان بێت، چونکە پەروەردەی سەرکەوتووانە کۆمەڵگا ئەپارێزێت لە خراپەکاریو گەندەڵی نەك بەزەبری دەسەڵاتو سیخوڕی کردن بە سەریانەوەو بەکار هێنانی توندو تیژیی.

٢ـ بایەخ بدرێت بە خێزان لە هەموو رووەکانیەوە، چونکە رۆڵێکی بنەڕەتی هەیە لە دروستکردنو پێگەیاندنی مرۆڤەکانو لانەکەی کۆمەڵگایەو بەختەوەری خێزانی یەکێکە لە هۆکارەکانی بەختەوەری کۆمەڵگا هەروەها پێویستە رۆشنبیری خێزانی بکرێتە بڕبڕەی پشتی بەرنامەکانی پەروەردەو فێرکردن.

٣ـ پێویستە بیرو بۆچوونو بینشی ئومەتەکان روونو ئاشکرا بکرێتەوە لایان بۆ ئەوەی لە بوونی خۆیان تێ بگەنو بزانن ئامانجیان چییە؟ هەوڵو کۆششیان بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئایا بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی هەقو ئاشتیو دادپەروەرە، یان بە پێچەوانەوە؟

٤ـ رۆڵی بانگەوازو پەروەردە بدرێت بەدەست میللەت خۆیەوە بۆ ئەوەی پەروەردەی نەوەکانیان بکەن دوور لە هەر کاریگەرییەكو بەرژەوەندییەکی تایبەتی.

٥ـ گرنگی دام‌و دەزگاو دامەزراوە میللییەکان کە سەربەخۆن‌و لەهەمان کاتیشدا یەك دەسەڵات کۆیان دەکاتەوە، دروستکردن‌و بەردەوام بوونیان ئەبێتە هۆی سەقامگیری بوونی گەل‌و دەوڵەت‌و درێژخایانی شارستانیەکەیان‌و بەدی هێنانی ئامانجەکانیان.

٦ـ هەروەها بەپاڵ دامەزراوەکاندا جەخت ئەخاتە سەر گرنگی کاری بە کۆمەڵ‌و هاوکاری لە نێو هەر میللەتێکدا. لەبەر ئەوە پێویستە بیرۆکەی تاکە کەسی‌و سەرەتایی لەخۆیان هەڵ کەنن ئەگەر نا پێچەوانەوە لە جیهانی ئەمڕۆو پێش بڕکێی نەتەوەکاندا جێگایەکی نییە.

٧ـ ئامانجی زیکرو پەیامی خوایی بیریتییە لە هەستان بە ئەرکی جێ نشینایەتی‌و بنیات نانی شارستانیەکی راستەقینە نەك دروستکردنی کۆمەڵگایەکی دەستەوسان‌و دانیشتوو تەنیا بەتەمای خوا بێت.

# ناوەڕۆک

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی سێیەم" | ن: فازل قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ كتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، رۆژهەڵاتناسی، ژن، رەخنەی ئەدەبی، رووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی رەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، رۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ – ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس |

| | | |
|---|---|---|
| | | و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی "بەرگی یەکەم" | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |